پرۆژەی خوێندنەوە بۆ هەمووان
زنجیرە کتێبەکانی بڕیار «١٠»

# مەشخەڵی ژیان





بەرزان ئەبوبەکر

2014




بە سپۆنسەری
گروپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن و گۆڤاری بڕیار

# مەشخەڵی ژیان

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٤

# مەشخەڵی ژیان

ناوی کتێب: مەشخەڵی ژیان
ئامادەکردنی: بەرزان ئەبوبەکر
دیزایین: گۆڤاری بڕیار
ساڵی چاپ: ٢٠١٤
نۆبەی چاپ: یەکەم
تیراژ: ٤٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٠٢٠)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە.

# پێشەکی

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

مەشخەڵی ژیان.. لەم ڕۆژگارە سەختو دژوارەدا، دەبێتە میوانی دڵەکانتانو بەوپەڕی هێمنییەوە لە دەروازەی ماڵەکانتان ئەدات.. تابێتە مەرهەمی هەتووانو سارێژی برینەکانو سۆمای ئەوینو هاوڕێی تەنهاییتان.

مەشخەڵی ژیان.. فێرمان دەکات وەکو ئەستێرە ڕووناکی ببەخشینو چاوەڕوانی سوپاسی کەسیش نەبین..

مەشخەڵی ژیان.. پێمان دەڵێت مرۆڤەکان لە ساتەوەختی لە دایکبووندا یەکسانن، بەڵام لە ساتی ماڵاوایی هەمیشەیی لە ژیان زۆر جیاوازن.. ئەوەش مانای وایە مرۆڤ بە دەستی خۆی ڕۆژگارەکانی ژیانی دەنەخشێنێت.. بە پلانو بەرنامەی خۆی مێژووی ژیانی ڕەنگین دەکات..

خوێنەری ئازیز.. مەشخەڵی ژیان چەندین بابەتو چیرۆکی جیهانی بواری پەروەردەو گەشەپێدانی لە خۆگرتووە، کە باس لە سەرکەوتنو هەوڵدانو نەسرەوتنو گەشبینی دەکات.. ژیاننامەو هەوڵدانو ئەزموونو شارەزایی کەسانێکە کە گەشبینو سەرکەوتووبوون لەم ژیانەدا، پەرتووکی مەشخەڵی ژیان.. زۆر پێویستە بۆ هەموو ئەو دایكو باوكانەی دەیانەوێت چیرۆکی سەرکەوتووانو گەشبینانو ئەزموونداران بۆ نەوەکانیان بگێڕنەوە.. بۆ تۆی مامۆستا زیاتر پێویستە، بۆ ئەوەی قوتابییەکانت بە ژیانو ئەزموونی سەرکەتووان ئاشنا بکەیت.. بۆ هەموو ئەو لاوانەی دەیانەوێت مێژووی ژیانیان ئاوێتەی سەرکەوتن بکەن، مەشخەڵی ژیان بخوێننەوە..

لە کۆتاییدا هیواداریین توانیبێتمان، مەڵۆیەکی دیکە بخەینە سەر کتێبخانەی کوردیو پشوویەکمان بە ڕۆحتان بەخشیبێت.

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٤/٢/٢





# ئەمڕۆ.. بۆنی تۆ
# لە بۆنی دایکم دەچێت!

یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنەوەی ساڵی نوێی خوێندن بوو، لەو کاتەی قوتابییان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەرەو پۆلەکانیان دەڕۆیشتنو بە وتەی هەست ناسكو وەسفی جوان، باسیان لە کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکانو دڵسۆزی مامۆستا بەڕێزەکانیان دەکرد، هەر یەك لە مامۆستا بەڕێزەکانیش لە بەردەمی یەکێك لە پۆلەکاندا بۆ پێشوازیکردن لە قوتابییەکانیان ڕاوەستابوون، مامۆستایەکیش کە لە بەردەمی پۆلی پێنجەمدا ڕاوەستابوو، گوێبیستی ئەو وتە ناسکانە بوو کە لە زاری قوتابییەکانەوە دەردەچوو، بە پەرۆشەوە بۆ قوتابییەکانی ڕووانیو پاش بە خێرهاتنەوەو پیرۆزباییکردن، پێی وتن: هەمووتانم زۆرخۆشدەوێت، هەروەها هەموو مامۆستاکانیش وەکو من ئێوەیان خۆشدەوێت، مامۆستاکە دەڵێت: لە دڵی

خۆمـــدا یەکێك لە قوتابییەکانم جیا کردبـــۆوە، چونکە لە وانەکانیدا زۆر لاوازبوو، ناوی (تیدی ستودارد).

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە ساڵی ڕابردوودا خاتوو (تومسون) چاودێرییەکی وردی تیـــدی کردبوو، تێبینـــی کردبوو کە تیدی لەگەڵ هاوڕێکانی یاری ناکات، هەمیشـــە جلوبەرگەکانی چڵکنە، وا دەردەکەوێت کە هەمیشـــە پێویستی بە خۆشۆرین هەیە، هەموو کات وەکو کەسێکی خەمبار دەردەکەوت.

ڕۆژی دواتـــر بەڕێوەبـــەری قوتابخانـــە داوای لـــە خاتـــوو (تومســـون) کرد، کە پێداچوونەوەیەك بکات بەســـەر تۆماری ســـاڵی ڕابردووی هەر یەك لە قوتابیان، لە کۆتاییدا تۆمـــاری تایبەتی تیدی چاوپێکەوت، لە کاتی پێداچوونەوەی ئەو تۆمارەدا شتێکی سەیری بەدیکرد، کە بووە مایەی سەرسوڕمانی!

* مامۆســـتای پۆلـــی یەکەمی تیدی ســـەبارەت بـــە تیدی نووســـیبووی: (تیدی قوتابییەکـــی زیـــرەك‌و پاك‌وخاوێنەو ڕۆح ســـوکەو خۆشەویســـتە لەلای مامۆســـتاو هاوڕێکانی.. بە ڕێکوپێکی‌و زۆر بە وردی گرنگی بە وانەکانی دەدات، هەروەها خاوەن ڕەوشتێکی بەرزو جوانە).

* مامۆستای پۆلی دووەمیشی سەبارەت بە تیدی بەمشێوەیە نووسیبووی: (تیدی قوتابییەکی ڕێکوپێکە، لای هەموو هاوپۆلەکانی خۆشەویستە، بەڵام هەمیشە خەمبارو نیگەرانە، بە هۆی ئەوەی کە دایکی تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە، ژیانیان لە نێو ماڵدا پڕبووە لە ناڕەحەتی‌و نا ئارامی‌و پشێوی‌و تەنگ‌وچەڵەمە).

* مامۆســـتای پۆلی ســـێیەمی سەبارەت بە تیدی نووســـیبووی: (بە هۆی مردنی دایکییەوە تیدی تووشی بارگرانی هاتووە، هەرچەندە ئەوپەڕی هەوڵی داو زۆر خۆی ماندووکرد، بەڵام نەیتوانی بەســـەر گرفتەکەیدا زاڵ بێت، چونکە ســـەرەڕای مردنی دایکـــی، باوکی گرنگییەکی ئەوتۆی پـــێ نەدەدا، ئەم جۆرەی ژیانی لە نێو ماڵدا زۆر کاریگەری خراپی لەسەر دەروونی تیدی دروستکردووە).

* لەو نێوەندەدا مامۆستای پۆلی چوارەمی سەبارەت بە تیدی نووسیبووی: (تیدی



کەسێکی داخراوەو زۆر حەز بە خوێندن ناکات، هەروەها بە هۆی گۆشەگیرییەکەیەوە خاوەنـــی هاوڕێیەکـــی ئەو تۆش نییـــە، زۆرجاریش لە کاتی وانە وتنـــەوەدا لە نێو پۆلەکەیدا خەوی لێدەکەوێت).

لێـــرەدا خاتوو (تومســـون) هەســـتیکرد کە تیدی گرفتێکی هەیە، بەڵام هەســـتی بە شـــەرمەزرای کرد بۆ ئـــەو تێڕوانینەی لەوەو پێش هەیبووە لەســـەر تیدی، ئەم هەڵوێستەش ئەوەندەی تر کارەکەی خراپ کرد، لە کاتێکدا قوتابییەکانی تومسون بە بۆنەی یادی لە دایکبوونییەوە دیارییان پێشکەش کرد، هەر یەك لە قوتابییەکان بە شـــێوەیەکی جوان لە زەرفێکی تایبەتدا دیارییەکانیان پێشکەشی مامۆستاکەیان کرد، جگـــە لـــە تیدی کە دیارییەکەی زۆر بە ناڕێکوپێکی لـــە عەلاگەیەکی ڕەنگ تاریکدا پێشکەشـــی خاتوو (تومســـون) کرد، لە ناکاو هەموو قوتابییەکان دەســـتیان کرد بە پێکەنین، کاتێك بینیـــان دیارییەکەی تیدی بریتییە لە ملوانکەیەکی ئەڵماس بەڵام تەزویر، لەگەڵ شوشـــەیەك عەتـــر کە تەنها چارەکێکی تێدا مـــاوە! ئەوەی جێگەی تێڕامان بوو ئەوەبوو.. بە خێرایی قوتابییەکان بێدەنگ بوونو پێکەنینەکەیان نەما، چونکـــە بینیان خاتوو (تومســـون) زۆر بە گرنگییەوە ڕوانییـــە دیارییەکانی تیدیو سەرسامی خۆی لەو ملوانکە جوانە دەربڕیو دەستبەجێ کردییە گەردنیو کەمێك لە عەترەکەشی پرژاند بە مەچەکیدا، ئەو ڕۆژە تیدی نەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە چاوەڕێی کرد تا گەیشـــت بە خاتوو (تومســـون)و پێی گوت: بۆنی تـــۆ ئەمڕۆ لە بۆنی دایکم دەچێت!!

قوتابییەکان ڕۆیشـــتنەوە بۆ ماڵەوەو قوتابخانەیان جێهێشـــت، خاتوو (تومسون) کە قسەکانی تیدی زۆر کاری تێکردبوو، نزیکەی یەك کاتژمێر دەستی کردە گریانو چاوەکانی هۆن هۆن فرمێسکیان هەڵدەوەراند، لەبەرئەوەی تیدی ئەو شوشە عەترەی پێشـــکەش کردووە، کە پێشـــتر دایکی بەکاری هێناوە، هەر بۆیە تیدی بۆنی دایکی کۆچکردووی لە خاتوو تومسوندا دەبینێت!

هـــەر لـــەو ڕۆژەوە تومســـون دەســـتی هەڵگرت لە وتنـــەوەی وانەیـــەك کە تەنها



خوێندنەوەو نووسینو بیرکاری بێت... بەڵکو دەستیکرد بە وتنەوەی هەموو وانەکانی منداڵ، (مامۆستای وەرز)، هەروەها لە پێشینەی کارەکانیدا گرنگیدانی تایبەت بوو بە تیدی، کاتێك گرنگی تایبەتی دا بە تیدی، بینی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تیدی باشترو چالاکتر دەبێت، هەر کات هانی ئەدا زۆر بەخێرایی کاری تێدەکرد، بە کۆتایی هاتنی ساڵی خوێندن، تیدی بووە یەکێك لە قوتابییە باشەکانی ئەو ساڵە، تادەهات زیرەکی زیاتر دەردەکەوت! پاش تێپەڕبوونی ئەو ساڵە خاتوو تومسون ڕۆژێکیان نووسراوێکی بینی لە بەردەرگاکەیدا، کە تێیدا نووسرابوو (بە ڕاستی باشترین مامۆستام کە لە ژیانمدا چاوم پێکەوتبێ خاتوو تومسون)ە!

شەش ساڵ تێپەڕی، بێئەوەی هیچ نووسراوێك، یان هەواڵێکی لە تیدییەوە پێ بگات، پاش ئەو شەش ساڵە نامەیەکی لە (تیدی)یەوە پێگەیشت، دوای هەواڵ پرسینو سوپاسو ڕێزو پێزانینو دەربڕینی وەفاداری، تیایدا نووسیبووی کە بە سەرکەوتوویی قۆناغی ئامادەییم تەواو کردووەو پلەی سێیەمم بە دەستهێناوە، بەڵام هەتا ئێستا تۆ چاکترین مامۆستامی کە لە ژیانمدا پێی گەیشتبم!

دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵی دیکە، پەیامێکی دیکەی لە (تیدی)یەوە پێگەیشت، کە تیایدا هاتبوو: (بەم نزیکانە بە پلەی یەکەم کۆلێژ تەواو دەکەم، بەڵام هەتا ئێستا لە لای من تۆ باشترینو دڵسۆزترین مامۆستایت).

پاش تەواوبوونی چوار ساڵی دیکە، تومسون پەیامێکی تری لە (تیدی)یەوە پێگەیشت، ئەمجارەیان نووسیبووی دوای ئەوەی توانیم بڕوانامەی بەکالۆریۆس بەدەستبهێنم، بڕیارمدا زیاتر بخوێنم، لە پەیامەکەیدا جارێکی تر جەختی لەوە کردبۆوە کە خاتوو تومسون باشترینو خۆشەویسترین مامۆستایەتی کە لە ژیانیدا پێی گەیشتووە، بەڵام لە کۆتایی پەیامەکەی ئەمجارەدا ناوەکەی درێژتر بوو لە جاران، ئەو نوسیبووی (دکتور/ پیودور إف ستودارد)!!

لێرەدا چیرۆکەکە کۆتایی نەهاتووە، لە بەهاری ئەو ساڵەدا پەیامێکی دیکەی نارد بۆ خاتوو تومسون، تیایدا نووسیبووی: (ئێستا کچێکم ناسیووەو دەمەوێت بیخوازمو

بیکەمە هاوسەرو هاودەمی ژیانم، هەروەکو لە پێشدا هەواڵم پێ دابووی کە باوکیشم پێش دوو ساڵ لە مەوبەر کۆچی دوایی کردووە، هەر بۆیە داوا لە بەڕێزت دەکەم کە تەشریف بهێنی بۆ ئاهەنگی گواستنەوەمانو لە شوێنی دایکی ئازیزم دابنیشیت، خاتوو تومسونیش بە خۆشحاڵییەوە داواکەی قبوڵ کرد، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەبوو کە خاتوو تومسون ئەو ملوانکەی کردبووە ملی کە چەند ساڵ لەوەوبەر تیدی پێشکەشی کردبوو، لەو جۆرە بۆنەشی بەکارهێنابوو کە تیدی پێشکەشی کردبوو)!!

دوای بەخێرهاتنێکی گەرمی مامۆستا بە وەفاو دڵسۆزەکەی، (دکتور ستودارد) بە ئەسپایی بە گوێی مامۆستاکەیدا چپاندو پێی گوت: زۆر سوپاس بۆ ئەو متمانەیەی بە منت هەبوو، هەروەها سوپاسی بێپایانم بۆ ئەو هەوڵە زۆرەی کە لەگەڵ منت کێشاو وات لێکردم هەست بە گرنگی خۆم بکەم، پێی ڕاگەیاند کە تۆ هۆکاری دەرکەوتنو پێگەیشتنی من بوویت.

خاتوو تومسونیش کە چاوەکانی پڕ لە ئەسرین بوون، وەڵامی دایەوەو وتی: تۆ لە هەڵەدایت، چونکە تۆ فێرت کردم کە من چۆن ببمە مامۆستایەکی لێهاتوو بە توانا، من نەمدەزانی چۆن وانە بڵێمەوە هەتا گەیشتم بە تۆ.

(تیدی ستودارد) ئەو پزیشکە بە ناوبانگەیە کە نەخۆشخانەیەکی تایبەتی هەیە بە ناوی مەڵبەندی (ستودارد)، بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێستا گەورەترینو باشترین مەڵبەندی چارەسەری شێرپەنجەیە نەك تەنها لە ئاستی شارەکەیدا، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

# نهێنی هه‌ستانه‌وه‌و پێشکه‌وتنی ژاپۆنییه‌کان!



نووسەری ئەمریکی (ئیدوین ئەشاور).. بابەتێکی نووسیوە لە ژێر ناونیشانی (ژاپۆنییەکان)، تیایدا پرسیارێکی گەوهەری کردووە، (نهێنی ژاپۆن چییە؟).. (نهێنی هەستانەوەو پێشکەوتنی ژاپۆنییەکان چییە؟)

لە وەڵامدا دەڵێت: نهێنی هەستانەوەو پێشکەوتنی ژاپۆنییەکان دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی:

١- ویستی تۆڵەسەندنەوە لە مێژوو. ٢- بنیاتنانی مرۆڤ..

ئەمە ئەو دوو هۆکارە سەرەکییەیە کە بووە هۆی هەستانەوەو بوژانەوەو پێشکەوتنی ژاپۆنییەکان، تۆڵەسەندنەوە لە مێژوو وەکو ئەوەی تەحەدای هەموو نەتەوەیەك بکەن، بۆئەوەی دوای هەستانەوەیان لەو شکستە گەورەیەی کە بەسەریاندا هات، بنیاتنانی مرۆڤیش لە ڕێگەی یاسای خوێندنو ڕۆشنبیرییەوە.. ئەو پێشکەوتنو هەستانەوەیەی ژاپۆن بە بەرزترینو گەورەترین سەرکەوتن دادەنرێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، لە نێو هەموو نەتەوەکانی جیهاندا، ئەو شکستە گەورەیەی کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا دووچاری ژاپۆنییەکان بووەوە، لە دەروونی نەوەکانیدا ئیرەییو دڵسۆزی بۆ وڵاتەکەیاند ڕواند، گڕی حەماسەتو پەرۆشی لە سینەو دەروونی لاوەکانیاندا چاند، تا بتوانن پێگەو شوێنی داهاتوویان لە نێو گەلانی جیهاندا دیاری بکەن!

لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامییان لە هەوڵداندا، ئەوان تا ئێستاش لە هەوڵداندان، بۆئەوەی بگەنە ترۆپکی پێشکەوتنو ژیارو شارستانییەت، لە نێو هەموو گەلانی جیهاندا، ئێستا ناوی ژاپۆن لە زیهنو بیروهۆشی هەمووواندا چاپ بووە، بەو پێشکەوتنو داهێنانو تەکنەلۆژیایەی پێشکەشی جیهانیان کردووە، ئەم وڵاتە شکستو دۆڕانی لە جەنگی جیهانی دووەمدا نەبووە هۆی وەستانی لە پێشکەوتنو داهێنان، ئەوەی ئەوان گرنگی پێدەدەن بۆ خزمەتو پێشکەوتنی وڵاتەکەیان، تەنها لە ڕێگەی زانستو زانیاریو کارکردنی دڵسۆزانەوەیە.

دوای ئەو شکستە سەختەی لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم دووچاری ژاپۆنییەکان بوو، زۆرێك لە سیاسەتمەدارانو خەڵکیش لەو بڕوایەدا نەبوون کە جارێکی تر ژاپۆن بتوانێت لەسەر قاچی خۆی ڕابووەستێت، لەبەرئەوەی ژاپۆن بووە دەوڵەتێکی دۆڕاوو وێرانو خاپور، هەربۆیە چاوەڕوانکراو نەبوو کە بتوانێت جارێکی دی لەسەر قاچی خۆی بووەستێتەوە، بەڵام ئیرادەو دڵسۆزیو هیواو ئاوات، دڵی هەموو ژاپۆنییەکانی پڕکرد..



**یابان لە ڕووی جوگرافیاوە:**

**کۆمەڵێك بارودۆخی مێژوویی‌و جوگرافی هاوکاربوون بۆ هاندانی ژاپۆن بۆ سەرکەوتن، جوگرافیای ژاپۆن تایبەتمەندییەکی ناوازەی هەیە، پێنج یەکی زەوییەکەی ناتوانرێت بەکاربهێنرێت‌و سوودی لێوەربگیرێت، بەشەکەی دیکەی زۆرکەم‌و بەرتەسکە بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی زۆری دانیشتوانی یابان، هەروەها زۆر سەختە کە بتوانرێت بەروبوومی پێویستی کشتوکاڵی دەستەبەر بکات بەشێوەیەك بەشی هەموو ژاپۆنییەکان بکات، لەبەرئەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان پەنا دەبەنە بەر زەوییە چۆڵەکان، لەشارە خاپوور بووەکان، لەبەر ئەم هۆکارە سروشتییە کارکردن لە ژاپۆندا سەدە لە دوای سەدە سەختترو قورستر دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا دوورگەکانی ژاپۆن کە بە درێژایی سنوری جوگرافیایاندا درێژبوونەتەوە، بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆرتر ئەگەری تووشبوونی هەیە بە گێژەڵۆکەو بوومەلەرزەی بەهێز، بەڵام دانیشتوانەکەی زۆر بە خێرایی لەگەڵ ئەو سروشتەدا ڕاهاتن، کارکردن لای ژاپۆنییەکان سیمایەکە لە سیما کەسایەتییە نیشتمانییەکانیان، هەروەها ڕێکخستن‌و کارکردنی بە کۆمەڵ، هەموو ئەمانە بەرهەمی مێژووی تازەیان نییە، بەڵکو هەر لە کۆنەوە ئەم سیمایانەیان هەبووە...**

**ژاپۆن دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیاوە، لە زنجیرە دوورگەیەك پێکهاتووە، (کە دەگاتە نزیکەی چوار هەزار دوورگە)، لە باکورەوە بۆ باشور درێژ بووەتەوە، لەسەر شێوەی ئەرخەبیل کە درێژییەکەی (٣٠٠٠) کیلۆمەترە، چوار دوورگەی سەرەکییان هەیە ئەوانیش: (هونشو، شیکوکو، کیوشو، هوکایدو)، ژاپۆن بەسەر ٤٣ ویلایەت‌و چوار شارەوانیدا دابەش بووە، ڕووبەری گشتی ژاپۆن دەگاتە نزیکەی (٨٨١٣٦٩) کیلۆمەتری چوارگۆشە..**

**ژمارەی دانیشتوانی یابان نزیکەی ١٢٧ ملیۆن کەسە، بەوەش بە حەوتەم وڵات دادەنرێت لە ڕووی زۆری ژمارەی دانیشتوانەوە، پایتەختەکەی (طوکیو)یە، ٩٩،٤٪ دانیشتوانەکەی لە بنەڕەتدا ژاپۆنین، ٠،٥٪ کۆریایین، ٠،١٪ ڕەگەزی جیاوازی ترن، لە ٧٩٪ی دانیشتوانیان لە شارە گەورەکاندا دەژین، ئەوانی دیکە لە گوندو لادێکاندا دەژین، لە ٣٥٪ دانیشتوانیان کاری پیشەسازی دەکەن، لە ٢٧٪ خەریکی کشتوکاڵ کردنن، نزیکەی ٧٠٠ حەوت سەد هەزار کەسیان ڕاوە ماسی دەکەن، ئەوانی دیکە سەرقاڵی کاری بازرگانی‌و پیشەی سەربەستن، بەشێکیشیان فەرمانبەرن لە دام‌و دەزگاکانی**

دەوڵەتــدا، زمانی یابانیش زمانی فەرمــی دەوڵەتەکەیانە، (یەن) ئەو دراوەیە کە بەکاریدەهێنن، چیاو دارســتانی چڕو پڕ، سێیەکی خاکی ژاپۆن پێکدەهێنێت، ئەم بەشە زۆرەش بۆ پیشەسازیو کشــتوکاڵو شوێنی نیشــتەجێبوون بەکارنایەت، لەبەرئەوە چڕی دانیشــتووان لە شارەکاندا زۆر بەرزە، هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە نرخی زەوی بۆ ڕێژەیەکی زۆر بەرزبێتەوە!

**هۆکارەکانی هەستانەوەی ژاپۆن دوای جەنگی جیهانی دووەم:**

لە نووسینێکی نایابدا، بە ناونیشانی (نهێنییەکانی بەڕێوەبردنی ژاپۆنی)، حسین حەمادی هەوڵیداوە کە وەڵامی ئەم پرسیارە گرنگە بداتەوە، (مرۆڤی ژاپۆنی چییان کرد، بۆ پڕکردنەوەو هەستانەوەی ژاپۆن لە دوای ئەو زیانەی لە جەنگی جیهانی دووەمدا دووچاری هات)؟

ژاپۆن چۆن توانی بگاتە ئەو ئاستەی ببێتە یەکێك لە سێ دەوڵەتە بەهێزەکەی ئابوری لەم سەردەمە نوێیەماندا؟

ئەم نوســەرە دەڵێت: دانیشــتوانی ژاپۆن لە ڕووبەرێکی زۆر کەمدا کە نزیکەی ٣٨٠ هەزار کیلۆمەتر تێناپەڕێت، ژیان دەگوزەرێنن، لە ٨٥٪ی چیاکانی بە چیای بورکانی ناسراون، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی تەواو هیچ سەروەتو سامانێکی سروشتی تێدا نییە.

لەســەردەمی ئیمپراتــۆر (میجــی مقالید) بە هاوکاری پیاوانی ســامورای ســاڵی ١٨٦٧ زاینــی لەو بڕوایەدا بوو کە چارەســەری گەلی یابانی بریتییــە لە تازەگەریی، ئەمەش بووە هــۆی ئــەوەی کە ژاپۆن بــووە ئەو دەوڵەتە ســەردەمییە بەهێزەی کە چووەتــە نێو بواری پیشەســازییەوە.. زۆر بــە بەهێزی بازاڕەکانی دەرەکی دەکاتەوە، ئەم فراوانبوونەش لەســەر حســابی دراوسێکانیەتی، هەروەها هێزی ســەربازیش کلیلێکە بۆ بەدیهاتنی ئەو پێشکەوتنە فراوانە، هەروەها ژاپۆن لە ســاڵی ١٨٩٥ توانی بەســەر وڵاتی چیندا ســەربکەوێت، پاشــان لە ســاڵی ١٩٠٥ بەســەر ڕووســیادا سەرکەوتو لە ســاڵی ١٩١٠ بەسەر کۆریادا ســەرکەوت، پاشان بەشداری جەنگی جیهانی یەکەمی کرد، دواتریش بەشداری جەنگی جیهانی دووەمی کرد، بۆ دەستبەســەراگرتنی هندو چینو فلیپینو مەلایۆو سەنغافورەو بورماو تایلاند، بەڵام هەموو ئەو ئاواتانەی ژاپۆن نەگەیشتە جێ، بەڵکو لە جەنگی جیهانی دووەمدا دووچاری شکستێکی گــەورە هــات، بە جۆرێك وڵاتەکەیان خاپور بوو، کە کەس لەو بڕوایەدا نەبوو جارێکی دیکە بتوانێت بنیادی بنێنەوە.

تاکە بەدلیش بۆ هەستانەوەی ژاپۆن دوای ئەو شکستە گەورەیە تەقینەوەی توانا نەتەوەیی‌و مرۆییەکان بوو.. لێرەوە مرۆڤەکانی ژاپۆن (واتە بیرۆکە کۆنەکانی ژاپۆن، کە پێیان وابوو چارەسەر بۆ پێشکەوتنی ژاپۆن، دەستبەسەراگرتنی زەوی وڵاتانی دراوسێی ژاپۆنە) کۆتاییان هات، هەروەکو دکتور حەمادی لە کتێبەکەیدا باسی لێوە دەکات، (بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕێگەیەکی ترەوەو بە بڕیارێکی نوێ)، بنەمای ئەم بڕیارە نوێیەش ئەوەبوو کە چارەسەر بۆ هەستانەوەی ژاپۆن لە ناو چوارچێوەو ناوخۆی یاباندایە، نەك شوێنێکی دیکە، ئەمەش پەیوەستە بە مرۆڤی ژاپۆنی‌و بە عەقڵی ژاپۆنییەکانەوە، لێرەوە ڕۆڵی بەرچاوی یاسای فێرکردن‌و پەروەردە هاتە مەیدان، بۆئەوەی یەك بڕیاری نەتەوەیی چارەنووسساز، پاشان لە بیرو هزری هەموو تاکێکی ژاپۆنیدا بیروێنن، لێرەوە عەقڵییەتی کۆنی ژاپۆن باشتر وایە بڵێین عەقڵییەتی پێش جەنگی جیهانی دووەم بەسەرچوو، لە ڕێگەی بڕیارە نەتەوەییە نوێکەیانەوە پەرە بە تواناو بیرو ژیری تاکەکانی ژاپۆن درا، نەك بە فراوانبوونی خاکی ژاپۆن، بە بەکارهێنانی هێزو چەك‌و سەرباز.

ئێستاش ژاپۆن ئەو دەوڵەتە پێشکەوتوو خاوەن پیشەسازییەیە، کە هەموو جیهانی سەرسام کردووە!

# سەرەتا
# لە دەروازەی سەرەکییەوە دەست پێبکە!!

پادشـــا (لویسی چواردەهەم) فەرمانی لە سێدارەدانی بـــۆ یەکێك لە زیندانییەکانی ئـــەو زیندانە دەرکرد، کە (لە قەدپاڵی چیایەکی دوور لە شاردا دروستکرابوو)، ئەو زیندانییەی کە فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو بوو، تەنها یەك شـــەوی مابوو بـــۆ جێبەجێکردنی فەرمانی لە ســـێدارەدانی، واتە ئەو لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوو کە سبەینێ کاتێك تیشـــکە وەنەوشەییەکانی خۆر قەدپاڵی چیاکـــە ڕووناك دەکاتەوە، دەبرێت بـــۆ بەردەمی پەتی سێدارەو لە گۆڕەپانی شاردا بە دیار چاوی جەماوەرێکی زۆر لە کەس‌و کارو دۆســـتو خۆشەویســـتانی فەرمانی لـــە ســـێدارەدانی جێبەجێ دەکرێت، بـــارودۆخ بۆ کاکی زیندانی یەکجار سەختو خەمناكو دژوار بوو، جگە لە بیرکردنەوە لەو کارەســـاتە نەیدەتوانی بیر لە شـــتێکی

دی بکاتەوە، چونکە ئەوە کۆتا ڕۆژی ژیانییەتی!

ئەم پادشایە واتە (لویسی چواردەهەم) هەندێجار هەڵسوکەوتی نامۆو کرداری سەیرو سەرنجڕاکێشــی ئەنجامداوە، هەر بۆیە ئەو شەوە (لویس) لەگەڵ پاسەوانەکانیدا ڕۆیشتن بۆ زیندان، زیندانییەکە بە هاتنی پادشا زۆر سەرسام بوو، ئەو لەوپەڕی نائومێدیدا بوو، پادشا ڕووی کردە زیندانییەکەو پێی وت: دەزانم سبەینێ بڕیارە لە سێدارە بدرێیت، بەڵام من دەمەوێت هەلێکت پێببەخشــم، ئەگەر توانیت سوود لەو هەلە ببینی ئەوا تۆ ڕزگارت دەبێتو ســبەینێ لە بری ئەوەی بچیتە بەردەمی پەتی سێدارە دەچیتەوە ناو کەسوکارو دۆستو ئازیزانت، لە بری خەمباریو شیوەنو گریان، خەندەو شادیو خۆشییان پێشکەش دەکەیــت، دواتر پادشــا وتــی: لەم زیندانــەدا دەروازەیەك هەیە بــۆ ڕزگاربوون کە هیچ پاسەوانێکی لێ نییە، ئەگەر توانیت ئەو دەروازەیە بدۆزیتەوە دەتوانیت بە ئاسانی بچیتە دەرەوەو ئازاد دەبیت، بەڵام ئەگەر نەتتوانی دەروازەکە بدۆزیتەوە، ئەوا ســبەینێ لەگەڵ هەڵهاتنی تیشــکی خۆر پاســەوانەکان دێن بە شــوێنتاو بەرێ دەخرێی بۆ بەردەمی پەتی ســێدارە! هیوادارم بەخت یاوەرت بێتو بتوانیت ئەو دەروازەیە بدۆزیتەوەو بە ئازادی لە زیندان بچیتە دەرەوە..

پادشــا دوای ئەم وتانەی زیندانەکەی جێهێشــتو هاتە دەرەوە، کاتێك گەیشتە دەرگای زیندانەکە قوفڵی دەرگاکەی بە کراوەی جێهێشــتو فەرمانی کرد ئەو شــەوە پاسەوانەکان زیندان جێبهێڵنو کەس لەو ناوچەیە نەبێت.

زیندانییەکە بیری لە وتەکانی پاشا دەکردەوە، زۆر دڵنیابوو لەوەی کە پاشا ڕاستگۆیەو ئەو قسانەشــی بە ڕاست بووەو گاڵتەی پێناکات، هەروەها دەیزانی کە چەند جاری تریش پادشــا ئەو جۆرە مامەڵانەی لەگەڵ زیندانییان کردووە، لەم کاتەدا زیندانییەکە جگە لە هەوڵــدان بۆ دۆزینەوەی ئــەو دەروازەیە چارەیەکی تری لە بەردەمــدا نەبوو، هەر بۆیە دەســتیکرد بە هەوڵدانو گــەڕان بۆ دۆزینەوەی دەروازەکە، زیندانەکە لە چەند ســووچو ژوورێکــی پێچاوپێــچ پێکهاتبوو، گەڕان بە نێــو زیندانەکەدا دژواربوو، لەگەڵ ئەوەشــدا کاتێکی زۆر کەمی بە دەستەوە مابوو، بە هەرحاڵ کات چاوەڕێ ناکاتو بەشێوەیەکی خێرا تێدەپەڕێت، لە یەکەم هەنگاوی گەڕانیدا هیوایەك دەرکەوت، دەروازەیەکی داپۆشــراوی لە

ژوورێکی زیندانەکەدا دۆزییەوە، ڕووپۆشـــەکەی لابـــردو پلیکانەیەکی بینی کە لە ڕێیەوە دەکرا بچیتە خوارەوە، کاتێك چووە خوارەوە کۆمەڵە پلیکانەیەکی دیکەی بینی کە بەرەو سەرەوەی زیندان دەڕۆیشت، چووەسەرەوە، پاشان پلیکانەی تری بینی، پاشان پلیکانەیەکی تر، بەمجۆرە بەردەوام بوو لە سەرکەوتن تا گەیشتە شوێنێك هەستی بە شنەبایەکی فێنك کرد، دڵنیابوو ئەوە هەوای فێنکی دەرەوەی زیندانە، ئەمەش زیاتر هیوای لا دروســتکرد، بەڵام هێشــتا پلیکانەکان کۆتاییان نەهاتبوو، بە هیوای دۆزینەوەی دەروازەکە ماندوویێتی نەدەناسیو بەردەوام سەردەکەوت، تا خۆی بینییەوە لە کۆتایی لوتکەی قەڵایەکی یەکجار بـــەرز بە ئەندازیەك بەرز بوو کە ڕادەی بینینی چاوەکانی نەیان دەتوانی دامێنی قەڵاکە ببینن، ماوەیەك بە سەرسامی مایەوەو هەڵێکی دیکەی بۆ دەربازبوون شك نەدەبرد، پاشان زۆر بە خەمباریو بەوپەڕی نا ئومێدییەوە بە شـــوێنی خۆیدا گەڕایەوە، لەگەڵ ئەوەشـــدا هەر دڵنیابوو کە پاشا فێڵی لێناکاتو بوونی ئەو دەروازەیە ڕاستە!

زۆر بە ماندوییو خەمو پەژارەیەکی زۆرەوە لە نێو زیندانەکەدا ڕاکشـــاو لە حەســـرەتا قاچەکانی دەکێشا بە دیواری زیندانەکەدا، لە ناکاو هەستیکرد بەردێکی دیواری زیندانەکە جوڵا، کاتێك دەســـتی دایـــە بەردەکەو دەریهێنا لـــە نێو ڕیزی دیوارەکـــە، ژێر زەمینێکی تەسکی بینی، کە نەدەتوانرا بە ناویدا بڕۆیت تەنها بە سنگە خشکێ نەبێت، لەبەرئەوەی چارەیەکی تری نەبوو، بە سنگە خشکێ بە ژێرزەمینەکەدا ملی ڕێگەی گرت، بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا گوێچکەکانی بە هاژەی ئاو زرنگایەوە، هیوایەکی هاتەوە بەر، ئەو وا هەستی کـــرد قەڵاکە تەنیشـــتی ڕووبارەکەی بەتاڵەو بە ئاســـانی دەتوانێت لەوێـــوە دەرباز بێت، بەڵام پەنجەرەیەکی ئاســـنینی داخراوی بینی، دەیتوانی لەوێوە ســـەیری ڕووبارەکە بکات، بەڵام نەیدەتوانی دەرباز ببێت، پاشـــان بەردەوام بوو لە ڕۆیشـــتن تا گەیشتە کۆتایی ژێر زەمینەکە، بەداخەوە ڕێگەیەکی داخراو بوو! دەستیکرد بە جوڵانی بەردەکانی دەوروبەری بەو هیوایەی دەروازەیەکی دیکە ببینێ، بەڵام هەموو هەوڵەکانی بێ ئاکام بوونو لە هەمان کاتدا شەو بەرەو شەقبوون دەچوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەردەوام لە هەوڵو گەڕاندا بـــوو، لە هەمـــوو گەڕانێکیدا هیوایەکی نوێی بەدی دەکرد، بەڵام ســـەرەنجام هەســـتیکرد شکستی هێناوە لە دۆزینەوەی ئەو دەروازەیەدا..

ناچار گەڕایەوە نێو زیندانەکە، دوای هەوڵدانێکی زۆرو بێ ئاکام شەوگار وەکو شەوانی دی کۆتایــی هاتو خۆر بە تیشــکە زێڕینەکەی دونیای ڕووناك کــردەوە، ئەویش لە نێو زیندانەکە بەوپەڕی خەمو پەژارەو بێ هیواییو دەروونێکی ڕووخاوەوە چاوەڕوانی هاتنی پاسەوانەکانی دەکرد، چونکە دڵنیابوو لەوەی مۆڵەتەکەی کۆتایی هاتووەو نەیتوانیوە سود لەو هەلە وەربگرێ کە پادشــا پێی بەخشــی بوو، لەم کاتەدا پاشاو پاسەوانەکانی دەرگای زیندانیــان کردەوەو بینیان زیندانییەکە دانیشــتووەو نەیتوانیــوە دەروازەکە بدۆزێتەوە، بۆیە پاشا پێی وت: دەبینم لە نێو زیندان ماویت؟!

زیندانییەکەش هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: لەو بڕوایەدا بووم کە تۆ ڕاستگۆبیت لەگەڵمدا! پادشــا وتی: بەڵێ دڵنیابە ڕاستگۆ بووم لەگەڵتدا! زیندانییەکە وتی: هیچ کونو کەلەبەرێکــی ئەم زیندانە نەماوە مــن نەگەڕێم بە ناویدا، ئەو دەروازەیە کامەیە کە تۆ بەڵێنت پێدامو وتت دەروازەیەك هەیە دەتوانی لەوێوە دەربازبیتو پاسەوانیشی لێ نییە؟!

پاشا زۆر بە ئارامییەوە وەڵامی دایەوە: دەروازەی سەرەکی زیندان کراوە بوو!!

کەواتە:

١- دەکرێــت پێــش ئەوەی کوێرە ڕێــگاکان تاقی بکەینەوە، ڕێگە ســەرەکییەکان تاقی بکەینەوە.

٢- کاتێك لە شوێنێك نیشتەجێ دەبیت، سەرەتا بە نێو هەموو دەروازەو ڕێچکەکانیدا بگەڕێو شارەزای هەموو دەروازەو کوێرە ڕێگاکانی ببە، ئەگەر پێشتر کاکی زیندانی هەوڵی بدایە لە هەموو جێگەیەکی نێو زیندانەکەی شارەزا بێت، ئەو شەوە کاتەکانی لە گەڕانی بێ ئاکامدا بەسەر نەدەبردو زۆر بە ئاسانی دەیتوانی ڕێگە سەرەکییەکە بدۆزێتەوە.

٣- کاتێك کەســێك قســەت بۆ دەکات بە تایبەت بۆ کارێکی ئاوا چارەنوســاز، زۆر بە وریاییەوە گوێی بۆ بگرە، ئەگەر ئەم زیندانییە بە دیقەتەوە گوێبیستی قسەی پاشا ببوایە لە مەبەســتی تێدەگەیشــتو دەیزانی شوێنێك پاسەوانی لێبێت بەردەرگایە، کەواتە ئێستا بەردەرگاکە چۆڵە، بۆیە پاشا دەڵێت پاسەوانی لێ نییە.

# ئەو پیاوەی لە ئاوەکەدا خنکا..

دەگێڕنـــەوە جارێکیـــان لە گوندێکدا پیاوێکی خوداپەرســـت  هەبوو، ئـــاکارو کردەوە جوانو دینداریەکەی وایکردبوو کە هەموو خەڵکی گوندەکە خۆشییان دەویستو متمانەیان پێی هەبوو.

خەڵکـــی گونـــد بۆ هەموو پرســـیارو ڕاوێژو کاروبارێکی ئاینـــی، دەگەڕانەوە بۆ لای ئەم خواناسو باوەڕدارە.. ئەوان بە پێشەنگو مامۆستای خۆیان دەزانی، هیچ کارێکیان بێ پرسی ئەو ئەنجام نەدەدا..

قەدەر وابوو، ڕۆژێك گوندەکە دووچاری لافاوێکی سەخت بووەوە، دەرچوونو خۆڕزگارکردن لەو لافاوە زۆر ئاستەم بوو..

چەند کەســـێك لە خەڵکی گوندەکە بە بەلەمێکەوە چوونە لای ئەم پیاو باشـــەو پێیان گوت: لەگەڵ ئێمە وەرە، لافاوەکە ســـەختەو تا دێت توندتر دەبێت، وەڵامی دانەوەو گوتی: پێویستم بە هاوکاری کەس نییە، خودای گەورە خۆی من ڕزگار دەکات، ئێوە بڕۆنو خەمی منتان نەبێت.. پیاو باشەکە بەردەوام نزای دەکردو دەیگوت: خودایە ڕزگارم بکە، لەو کاتەدا کەسانێکی دی بە کەشتییەوە بەلایدا تێپەڕینو گوتیان: لەگەڵ ئێمە وەرە، ئەمڕۆ ئاستەمە



کەس لە زیانی ئەم لافاوە ڕزگاری ببێت، دووبارە گوتی: پێویستم بە هاوکاری کەس نییە، خودای گەورە خۆی من ڕزگار دەکات، ئێوە بڕۆن..

پاش ماوەیەکی ترو بۆ جاری سێیەم، فڕۆکەیەك کە بۆ ڕزگارکردنی ئەو کەسانە هاتبوو کە هێشــتا لە نێو گوندەکەدا ماونەتەوە، لە دوورەوە ئەم پیاوەیان بەدیکردو لێی نزیك بوونەوەو بانگیان کرد تا ســەری بخەنە نێو فڕۆکەکەو لە زیانی لافاوەکە ڕزگاری بکەن، پێیان گوت: لەگەڵ ئێمە وەرە، چونکە ئێمە کۆتا فریاگوزارین کە هاتووین بۆ ڕزگارکردنی ئێوە.. کەســێك جگە لە تۆ لەم گوندەدا نەماوەتەوە، ئەگەر لەگەڵ ئێمە نەیەیت، ئەوا بە دڵنیاییەوە لە ئاوەکەدا دەخنکێیت!

هەمان وەڵامی ئەوانیشی دایەوەو وتی: ئێوە بڕۆن، من خودای گەورە ڕزگارم دەکات..

پاش چەند ڕۆژێك لافاوەکە تەواو بوو، خەڵکی گەڕانەوە بۆ گوندەکەیان، بە پەرۆشەوە دەگەڕان لە شوێنەواری مامۆستاکەیان، تا بزانن چی بەسەرهاتووە، بەداخەوە تەرمەکەیان دۆزییەوە، مشــتومڕ لە ناو خەڵکی گونددا دروســتبوو، خەڵکی دەیانگوت بۆچی خودای گــەورە ئەم پیاو باشــەی ڕزگار نەکــرد؟ بۆچی خودا نزاکانی گیرا نەکرد؟ کار گەیشــتە ئەوەی خەریکبوو هەندێك لە خەڵکی ئاواییەکە لە ئاینەکەیان پەشیمان ببنەوە!

لەو کاتەدا لاوێکی تێگەیشتوو ڕۆشنبیری خاوەن زانست هات بۆلایان، کاتێك ڕووداوەکەیان بــۆ گێڕایــەوەو تەواو لە مەســەلەکە حاڵی بوو، پێی گوتن: کێ دەڵێــت خودای گەورە ئەم پیــاوەی ڕزگار نەکردووە؟ خودای گــەورە (٣) جار ئەو بەندەیەی ڕزگار کردو نزاکانی گیرا کرد، مەگەر سێ کۆمەڵی یەك لە دوای یەکی نەنارد بۆ لای، تا یارمەتی بدەنو ڕزگاری بکەن لە لافاوەکە، بەڵام ئەو لەگەڵیاندا نەڕۆیشتو بە هاوکاریو یارمەتییەکانیان ڕازی نەبوو؟!

کەواتــە دەکرێت ئەم ڕووداوە ببێتە پەندو وانــەی زۆری لێوە فێربین، خودای گەورە بــە ڕێگای وەهمیو خورافیات بەندەکانی لە تەنگــژەو ناڕەحەتیو تیاچوون ڕزگار ناکات، خۆناکرێت فریشــتەیەك لە ئاســمانەوە دابــەزێو هاوکاریمان بــکات، بێگومان هاوکاریو یارمەتیدانو ڕزرگاربوونمان لە ناڕەحەتییەکان، بە هۆی ئەو کەســانەوە دەبێت کە خودا بۆمان دەســتەبەردەکات، بێگومان هەموو شــتێك هۆکارێکی هەیە، ئەوەی پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەوەیە کە تێبکۆشێت تا ئەو کاتەی هاوکاریو یارمەتییەکانی خوداوەندی پێدەگات، ئەویش لە ڕێگەی بەندەکانییەوە.




# بڕیارەکەی پادشای فەرەنسا!

**گەر دەتەوێت بڕیارەکانت جێبەجێ بکرێن، با ڕاوێژکارو حەکیمەکانت ژیرو لێهاتوو بن!**

یەکێك لە پادشاکانی فەرەنسا بڕیارێکی دەرکرد، لە بڕیارەکەدا هاتبوو کە نابێت ئافرەتان بە خشڵو زێڕ خۆیان بڕازێننەوە، بڕیارەکە بە تەواوی وڵاتدا پەخشکراو سەربازانی پادشا بە هەموو کوچەو کۆڵانەکانی ئەو وڵاتەیان ڕاگەیاند، کە ئیدی نابێت ئافرەتان خۆیان بە خشڵو زێڕ بڕازێننەوە!

دەرکردنــی ئەم بڕیارە کاردانەوەیەکی تونــدو نارەزاییەکی بێ وێنەی لە نێو ئافرەتانی فەرەنســادا لێکەوتــەوە، ئافرەتانی ئەو وڵاتە بە نێو شــەقامەکانی شــاردا بڵاوبوونەوەو بڕیاریاندا بە هیچ شــێوەیەك گوێڕایەڵی فەرمانەکەی پادشــا نەکــەن، نارەزاییو بێزاری ئافرەتانی شار هەموو کوچەو کۆڵانێکی ئەو وڵاتەی گرتەوە، بۆ سەرپێچیکردنی فەرمانەکە هەمــووان لــە جاران زیاتر بە خشــڵو زێر خۆیان ڕازاندەوەو ڕژانە ســەر شــەقامەکان، هەواڵی نارەزایی ئافرەتان کۆشکی پادشای هەژاند.. هەر بۆیە پادشا داوای کۆبوونەوەیەکی نائاسایی لە ڕاوێژکارانی کرد، ڕاوێژکارو وەزیرەکانی پادشا ئامادەبوون، گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە ســەبارەت بە نارەزاییەکانی ئافرەتان لە بەرامبەر بڕیارەکەی پادشای وڵاتدا دەستیپێکرد، هەندێــك لــە ڕاوێژکاران پێیان وابوو پادشــا لە پێناوی بەرژەوەندی گشــتیو گەڕانەوەی هێمنیو ئارامی بۆ وڵاتەکەیان، پێویســتە لە بڕیارەکەی پاشــگەز بێتەوە، هەندێکی تریان بۆچوونیان وابوو پاشــگەزبوونەوە لە بڕیار، بەڵگەی شکســتو لاوازییە، بۆیە پێویســتە

بڕیارەکە جێبەجێبکرێتو پادشا بیسەلمێنێت کە دەسەڵاتو توانای بڕیاردانی هەیە.

پادشا وتی: ئێوە بۆ تیاچوون باشن هەمیشە لە نێو خۆتاندا ناکۆکنو ناتوانن لەسەر خاڵێك ڕێکبکەون، پاشان فەرمانی کردو وتی: بڕۆن بۆ لای حەکیمی شارو بانگهێشتی بکەن بۆ لامان، تا بزانین ئەو ڕێگە چارەیەکی گونجاوی لا دەستدەکەوێت، کاتێك حەکیم گەیشتە کۆشکی پادشاو گرفتەکەیان بۆ ڕوونکردەوە، لە وەڵامدا وتی: جەنابی پادشا خەڵکی گوێڕایەڵی فەرمانەکانت ناکەن ئەگەر تۆ وابیر بکەیتەوە کە تۆ چیت دەوێت، بەڵکو دەبێت بیر لەوە بکەیتەوە کە هاوڵاتییەکانت چییان دەوێت!

پادشا وتی: ئێستا دەبێت چی بکەین؟ ئایا لە بڕیارەکەم پاشگەز ببمەوە؟

حەکیم: نەخێر، بەڵکو جوانکاریو ڕاستکردنەوەو ڕوونکردنەوە بۆ بڕیارەکەت زیاد بکە، بەمشێوەیە: خۆڕازاندنەوە بە خشڵو زێڕ لە تەواوی وڵاتدا قەدەغەیە، چونکە ئافرەتانی جوانو قەشەنگ پێویستیان بە خۆڕازاندنەوە نییە، پاشان لە خاڵی دووەمی بڕیارەکەتدا جیاکارییەك بکەو بڵێ: ئەم بڕیارە ئەو ئافرەتانە ناگرێتەوە کە ڕووخساریان ناشیرینەو تەمەنیان چووەتە سەر، دەیانەوێت بەم مەبەستەیان ناشیرینی ڕووخسارو بەساڵاچوونیان بشارنەوە.

حەکیم بە پادشای گوت: بەمشێوەیە خەڵکی گوێڕایەڵت دەبن.. هەمووان بۆچوونەکەی حەکیمیان لاپەسەند بوو، دەستبەجێ پادشا ئەو بڕیارەی دەرکرد..

**دەزانن بەبیستنی بڕیارەکە چی ڕوویدا؟**

ئافرەتە بە تەمەنو ڕووخسار ناشیرینەکان زیاتر لە ئافرەتە قەشەنگو جوانەکان بڕیارەکەیان جێبەجێکرد، چونکە هەر یەکەیان سەیری خۆیان دەکردو دەیانگوت من جوانم پێویستم بە خۆڕازاندنەوە بە خشڵو زێڕ نییە، خۆ ئەگەر خۆیان بڕازاندایەوە ئەوا بەڵگە بوو لەسەر ناشیرینیو پیریی ئەو کەسە..

کاتێك بە ژیری ئەوان بیر دەکەیتەوە، شارەزای خەمو پێداویستییەکانیان دەبیت، هەست بە ئازارەکانیان دەکەیت.. دارشتنی قسەو بڕیار، هونەرێکە پێویستی بە کەسی ژیرو لێهاتوو بە توانا هەیە، زانستێکە پێویستە فێری ببین، بەکاریبهێنین لە بانگەوازو پەروەردەو وانە وتنەوەو فێرکردنو فێربووندا، بۆئەوەی بگەین بەو ئامانجەی دەمانەوێت، هەروەها پێویستە پێش دەرکردنی بڕیارەکانمان، ڕەچاوی پەرچەکرداری بەرامبەر بکەین، نابێت بڕیارێك، یان داوایەك بکەین، کە جێبەجێکردنی ئاستەم بێت، کەواتە گەر دەتەوێت گوێڕایەڵیت بکەن، داوای شتێك بکە لە تواناداببێت.

# خەم

## ئەو دێوەزمەیەی کە مرۆڤ لەناودەبات

پادشای وڵاتێك، بە دەست نەخۆشی قەڵەویو چەوریو کێشی زیادەی لەشییەوە دەیناڵاند، بۆ ئەم مەبەستە سەرجەم پزیشكو حەکیمەکانی بۆ کۆشکی پاشایەتی بانگهێشت کرد، تا چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوەو کەمێك لەو چەوریو قەڵەوییەی کەم بکەنەوە، بەڵام هەر ڕێگەیەکیان بۆ دادەنا، بە هۆی پارێزنەکردنو نەوسنی جەنابی پادشاوەو ڕەچاونەکردنی ئامۆژگاری پزیشکەکان، نەیاندەتوانی سەرکەوتووبن...

ڕۆژێکیان پیاوێکی ژیرو دانا هات بۆ کۆشکی پادشاو پێی گوت: جەنابی پادشا، بە پشتیوانی خودا من دەتوانم چارەسەری کێشەکەتان بکەم، پادشا بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر شادمان بوو، دانای ژیر وتی: من شارەزای زانستی ئەستێرە ناسیم، سەرەتا دەمەوێت ڕێگەم بدەیت تا ئەمشەو سەیرێکی ئەستێرەکانی ئاسمان بکەم، بۆئەوەی بزانم چ دەرمانێك بۆ دەردەکەی بەڕێزتان دەگونجێت.

بۆ ڕۆژی دوایی دانای ژیر گەڕایەوە بۆ لای پادشاو پێی گوت: بەپێی ئەو ئەستێرەیەی من ئەمشەو سەیرم کرد، بەداخەوە تەمەنی بەڕێزتان لە ژیاندا تەنها یەك مانگی ماوە، ئیدی ئەگەر دەتەوێت دەوایەك بەکاردەهێنم بۆ چارەسەری گرفتەکەت؟

ئەگەریش دەتەوێت لە ڕاستی قسەکەی من دڵنیا بیت، ئەوا دەتوانیت ئەو ماوەیە لای خۆت زیندانیم بکەیت، ئەگەر بۆچوونەکەم ڕاست دەرچوو، ئەوا فەرمان بدە دوای کۆچی دوایيو ماڵئاوایی بەڕێزتان ئازاد بکرێم، ئەگەریش بە پێچەوانەوە بوو، ئەوا دەتوانیت بە

دەستی خۆت تۆڵەم لێبسێنیت.

پادشا بە لێکدانەوەکەی زۆر نیگەران بوو، فەرمانی دا دەستگیری بکەن، لەو ڕۆژە بەدواوە پادشا خۆی لە خەڵکی دابڕی‌و بە تەنها لە ژوورێکدا بە خەمباری ژیانی دەگوزەراند، قسەی لەگەڵ هیچ کەسدا نەدەکرد، جگە لە هاوسەرەکەی ڕێگەی نەدەدا کەس بێتە سەردانی! هەر ڕۆژێك بەسەریدا تێدەپەڕی خەم‌وپەژارەی زیادی دەکرد، چونکە قسەی داناکە زۆر کاری تێکردبوو، چاوەڕوانی مەرگی دەکرد.. چاوەڕوانی زۆرناخۆشە، ئەی ئەگەر ئەو چاوەڕوانییە چاوەڕوانی هاتنی مەرگ بێت، دەبێت چۆن بێت؟

پاشا لە چاوەڕوانی مەرگداو لە خەمی هاتنی ئەو ڕۆژەدا زۆر لاواز بوو، چەوری جەستەی بە جارێك توایەوە، کێشی زۆر دابەزی، بەمجۆرە بیست‌وهەشت ڕۆژ تێپەڕی!

لەو ڕۆژەدا پادشا ئارامی لێبڕاو خەم‌وپەژارەکەی یەکجار زیادی کرد، ناردی بە دوای داناکەداو پێی گوت: هەواڵێکی تازەت لانییە؟

دانای ژیر کاتێك پادشای بینی بە تەواوی لاواز بووەو کێشی دابەزیوەو لە نەخۆشی قەڵەوی ڕزگاری بووە، بە ئارامی وەڵامی دایەوە: جەنابی پادشا لە ڕاستیدا من زۆر لەوە کەمترم کە شارەزای زانستی نادیارو ئایندە بم، زانینی ئایندە تەنها لە دەسەڵاتی خوای گەورەدایە، سوێند بە خوا من نازانم خۆم کەی تەمەنم کۆتایی دێت‌و ئەم دنیایە جێدەهێڵم، چ جای ئەوەی بزانم تۆ کەی تەمەنت کۆتایی دێت! بەڵام هیچ دەوایەکم چاکتر شك نەبرد بۆ دەردەکەی بەڕێزتان، جگە لە خەم‌و پەژارە، هیچ ڕێگەیەکی تریشم نەدەزانی کە بتوانم وابکەم تۆ خەم بخۆیت، جگە لەم ڕێگەیە! کاتێك پادشا زانی ئەمە پلانێك بووە بۆ چارەسەری دەردەکەی، ئیدی لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات!!

بەڕاستی خەم‌وپەژارە، چەوری دەتوێنێتەوە، کێش دادەبەزێنی‌و کێو لە بن دێنێت! هەربۆیە پێشەوا (سەلامی خوای لێبێت) لە نزاکانیدا دەیفەرمoو:

(اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن... خودایە پەنات پێدەگرم لە خەم‌وپەژارە....)

ئێستا با پێکەوە وردبینەوە، کارەکانی خوای کردگار چەندە جوانە! ئەگەر مرۆڤ بیزانیایە کەی کۆتا ڕۆژی ژیانییەتی، چی ڕووی دەدا؟ خەم‌وپەژارە بۆ هەمیشە دەبووە میوانی‌و بەردەوام لە بیری ئەو ڕۆژە دیاریکراوەدا دەبوو کە کۆتا ڕۆژی ژیانییەتی! پاکوبێگەردی بۆ ئەو خودایەی مرۆڤی بەشێوەیەك دروستکردووە کە نازانێت کەی بۆ دواجار ماڵئاوایی لە ژیان دەکات!!

# پادشاو وەزیرەکەی!

کابرایەکی دەشـــتەکی لەگەڵ هاوســـەرەکەیدا دوور لە شار لە خێمەیەکدا ژیانیان دەگوزەرانـــدو بژێوی ژیانیان بریتی بوو لە بەخێوکردنی مەڕوماڵات، ئەوان ژیانێکی ئاســـوودەو ئارامیان هەبوو، میوان دۆســـتو بە خشـــندەبوون، هەر کەس بهاتایەتە ماڵیان ڕێزیان لێدەگرتو خزمەتیان دەکرد..

ڕۆژێکیان جەنابی پادشا لەگەڵ وەزیرەکەیدا لە گەشتێکدا دەبن، ئێوارە درەنگانێك دەگەنە نزیك خێمەی ئەم کابرا دەشـــتەکییە، پادشـــاو وەزیر ڕوو دەکەنە خێمەکەو بەبێئـــەوەی خۆیان بناســـێنن داوایـــان لێدەکەن کە ئەو شـــەوە میوانداریيان بکەن، تا بۆ ســـبەی درێژە بە گەشـــتەکەیان بدەن، ژنو مێردە دەشـــتەکییەکە بەبێئەوەی بیانناســـن وەکو نەریتی هەمیشەیی خۆیان، کە زۆر خزمەتی میوان دەکەنو ڕێزیان لێدەگرن، هەرواش بە هەمان شێوە زۆر ڕێز لەو دوو میوانەی ئەو شەوەیان دەگرنو بە جوانترین شـــێوە پێشـــوازییان لێدەکـــەنو خزمەتیان دەکەن، بۆ ســـبەی کاتێك



خۆرهەڵات، کاتی ئەوەبوو پادشاو وەزیر ماڵاوایی لەو ماڵە خنجیلانەیە بکەنو درێژە بە گەشـــتەکەیان بدەن، لە کاتی ماڵاواییدا پادشـــا خۆی ناســـاندو وتی: من پادشای شـــارمو ئەوەش وەزیرەکەمە، زۆر سوپاسی کردن بۆ ئەو میوانداریو ڕێزدارییەیان.. داوای لێکردن کە هەر کات پێویستییەکیان هەبوو سەردانی شار بکەنو بێنە کۆشکی پادشا تا بەوپەڕی تواناوە هاوکارییان بکات..

ڕۆژەکان تێپەڕین، دوای چەند ســـاڵێك، وشکە ساڵی یەك لە دوای یەك تەنگی بە تەواوی خەڵکی هەڵچنی، بە تایبەت خەڵکی گوندو دەشتەکییەکان..

خێزانی کابرای دەشتەکی زۆری لە هاوسەرەکەی کرد تا بڕوات بۆ کۆشکی پادشاو داوای هـــاوکاری لێ بکات، بۆ ڕزگاربوون لـــەو تەنگانەو نەبوونیو نەدارییەی کە بە هۆی وشکە ساڵییەوە دووچاریان هاتووە..

کابـــرای دەشـــتەکی هەرچەنـــدە پێی خۆش نەبـــوو بڕوات بۆ لای پادشـــا، بەڵام سووربوونی خێزانەکەی ناچاری کرد کە ملی ڕێگە بەرەو کۆشکی پادشا بگرێتەبەر.. کاتێك گەیشـــتە شـــار کاتی نوێژی نیوەڕۆبوو، پێش ئەوەی بڕوات بۆ کۆشکی پادشا ڕۆیشـــت بەرەو مزگەوت تا نوێژەکەی بەجێبهێنێو دواتر بڕوات بۆ کۆشـــکی پادشا، هەر کە گەیشتە نێو مزگەوتەکە بینی پادشا لە سوچێکی مزگەوتەکەدا دانیشتووەو دەســـتەکانی بەرەو ئاســـمان بڵند کردووەو زۆر بە کوڵ لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە، بینینی ئەو دیمەنە تەواو سەرسامی کرد!

کابرای دەشـــتەکی بە ئارامی نوێژەکەی تەواو کردو زۆر بە هێمنیو بە ئەسپایی، بێئەوەی داوای پێویستییەکەی لە پادشا بکات، لە مزگەوت هاتە دەرەوە، لەبەرخۆیەوە گوتی: کاتێك پادشا لە خوای گەورە داوا دەکات، ئەی بۆچی دەبێت منیش لە خوای گەورە داوا نەکەمو لە کەسێکی دیکە داوا بکەم؟!



# ئایا سەروەتو سامان دەبێتە هۆی بەختەوەری مرۆڤ؟

ئەگــەر لە هەر کەسـێك لەم جیهانەدا بپرسـیت، بە بۆچوونی تـۆ، گرنگترین هۆکاری بەختەوەری بۆ مرۆڤ چییە؟ یاخود بپرسیت مرۆڤ چۆن بەختەوەر دەبێت؟

ئـەوا زۆربەی خەڵکی زۆر بە ڕاشـکاوانەو بێ دوودڵیو دەسـتبەجێ لـە وەڵامدا دەڵێن: گەورەترین هۆکاری بەختەوەری بۆ مرۆڤ ماڵو سامانە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زۆرێك لە خەڵکی وادەزانن تەنها لە ڕێی سەروەتو سامانەوە مرۆڤ دەتوانێت بەختەوەری بەدەست بهێنێـت، هەروەها خەڵکی پێیان وایە هەموو مرۆڤێکـی دەوڵەمەند، مرۆڤێکی بەختەوەرە، ئەمەش لە ڕاستییەوە دوورە! لەبەر ئەم هۆکارە ئێمە پرسیار لە بەختەوەری دەروونی مرۆڤ دەکەین، واتە چ جۆرە مرۆڤێك خاوەنی دەروونێکی ئارامو ئاسوودەو دڵێکی بەختەوەرە؟

ئەگەر مرۆڤ وا هەسـت بکات کە سـەروەتو سـامان دەتوانێت بەختەوەری بۆ مرۆڤ دروسـت بکات، ئەوە لە هەڵەدایە، چونکە هیچ کات سـەروەتو سامان ناتوانێت ئاسوودەیی دەروونـی بۆ مرۆڤ دروسـت بکات، ڕەنگە بڕواکردن بەمجـۆرە وەڵامە کەمێك دژوار بێت، چونکە زۆرێك لە مرۆڤەکان وا هەست دەکەن کە تەواوی کێشەو گرفتەکانی ژیان بە پارەو سامان چارەسەر دەکرێتو زۆرێك لە کێشەکانی ژیانیان هۆکارەکەی نەبوونییە! ئەمە ڕەنگە تا ئەندازەیەك وابێت.. بەڵام ئەگەر سـەد لە سـەد ئەم وەڵامە ڕاست بووایە، ئەوا ملیۆنێرو دەوڵەمەندەکان هیچ گرفتێکیان نەدەبوو، هەروەها بەختەوەرترین مرۆڤیش دەبوون، ڕەنگە تۆش بڵێیت: ئەگەر منیش وەکو فیسـارەکەس خاوەنی ئۆتۆمبێلی مۆدێرنو خانووی چەند نهۆمـیو دووکانی بازرگانیو ..هتد، بوومایە، ئەوا هەموو خەمەکانم دەڕەوییەوەو دەبوومە مرۆڤێکی بەختەوەر، چونکە بە بۆچوونی تۆ تەنگو چەڵەمەکانی ئێستای ژیانت هۆکارەکانی

ماددین! بۆ وەڵامدانەوەی ئەم بۆچوونەت با پێکەوە ئەم چیرۆکە سادەیە بخوێنینەوە، تا بزانین ئایا سەروەتو سامان هۆکارێکە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری؟

یەکێك لە هاوڕێکانم باسی لە ئەزموونی خۆیکرد لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێ ملیۆنێرەکانی، ئەو وتی: ملیۆنێرەکان بۆ هەر یەك لە منداڵەکانیان پێویستیان بە قوتابخانەی تایبەت هەیە! جگە لەوەش دەبێت ئۆتۆمبێلی تایبەت هاتوچۆیان پێبکات، هەروەها پێویستیان بە پاسەوانو خزمەتکار.... هتد، هەیە! ئەم هاوڕێیەم وتی: جارێکیان ملیۆنێرێکی هاوڕێم بانگهێشتی کردم بۆ خوانی نیوەڕۆ، کاتێك چوومە بەر دەرگای ماڵییان، سەرەتا چاوم کەوت بە جۆرەها ئۆتۆمبێلی مۆدێرن، کە جوانییەکانیان سەرسامیان کردم، پاشان گەیشتمە باخچە ڕازاوەو فراوانەکەی ناو ماڵەکەی، ئەوەندە دڵڕفێن بوو کە مرۆڤی سەرسام دەکرد! یەکێك لە پاسەوانەکان ڕێنمایی کردم بۆ هۆڵی پێشوازی، دوای ئەوەی گەیشتمە هۆڵەکەو پێکەوە دانیشتین، نەمدەزانی سەیری چی بکەم، ئەوەندە شتی عەنتیکەو نایابی لێبوو، لە دڵی خۆمدا وتم: من چەند نەزانم وا هەستدەکەم بەختەوەرم، لە ڕاستیدا بەختەوەر ئەم دەوڵەمەندانەن کە خاوەنی ئەم کۆشكو تەلارو سەروەتو سامانە بێ شومارەن! پاشان بانگهێشت کراین بۆ سەر خوانی نیوەڕۆ، کاتێك چووینە سەر خوان جۆرەها خواردن لەسەر خوانەکە ڕازابووەوە، کە نەتدەزانی لە کامیان بخۆیت، بەڵام لە ناکاو توشی شۆك بووم، چونکە گوێچکەکانم بە کۆمەڵێك وشەی سەیرو چاوەڕوان نەکراو زرنگایەوە کە لە زاری هاوڕێ ملیۆنێرەکەمەوە هاتنە دەر، پێی وتم: فەرموو بەڕێزتان نانی خۆتان بخۆن چاوەڕوانی من مەکەن، چونکە من ناتوانم ئەو خواردنانە بخۆم! وتم: بۆچی؟

زۆر بە خەمبارییەوە وتی: خەڵکی وادەزانن ئێمەی دەوڵەمەند زۆر بەختەوەرین، لە ڕاستیدا وانییە! پزیشك هەموو ئەو جۆرە خواردنانەی لێ قەدەغە کردووم، بە هۆی پەستانو چەوری خوێنو نەخۆشی شەکرەو... هتد، تووشی جۆرەها نەخۆشی بووم، سەد بریا وەکو کەسێکی زۆر سادە ژیانم بگوزەرانایە، بەڵام لەشساغو تەندروست بوومایە! لێرەدا ئەم پەندە کوردییەم وەبیر هات کە دەڵێت: (مەڵێ هەژارم کوفری نیعمەتە، لەشی ساغ بۆ تۆ موڵكو سەروەتە!).. دوای ئەوەی هیوای چاکبوونەوەم بۆ خواستو هاوخەمی خۆمم بۆ دەربڕی، بەدەم نانخواردنەوە پرسیارم لە خانەوادەکەی کردو وتم: ئەوان حاڵییان چۆنە؟ جارێکی تر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو بەخەمبارییەوە وتی: تەنها بە تەلەفۆن هەواڵی یەکتری دەزانین، چونکە ئەوان چەند ساڵێکە ئەم وڵاتەیان جێهێشتووەو لە هەندەران دەژین، تەنها

له يادو بۆنه تايبەتييەكاندا به سەردان دەگەڕێنەوە! پاشان وتی: بەڕاستی ئێمه ئیرەیی به ئێوه دەبەین، كه ئەوەنده خۆتان ســەرقاڵ نەكردووه به كۆكردنەوەی سەروەتو سامانەوەو ژیانێكی ئارامو ئاسووده لەگەڵ خانەوادەكانتان بەسەردەبەن! ئەو كات تێگەیشتم كه من له هەڵەدام گەر وابزانم سەروەتو سامان دەبێته هۆی بەختەوەری مرۆڤ!

كەواته خوێنەری ئازیز: مەرج نییه هەموو ماڵو سامانێك تۆ بەختەوەر بكات، ڕەنگه كەسانێك هەبن بەهۆی ســەروەتو سامانەوه بەختەوەرییان دەســتكەوتبێ، بەڵام دڵنیابه ئەوانه ڕێژەیەكی زۆر كەمن، چونكه ســامان كاتێك مرۆڤ بەختەوەر دەكات كه له دەســتتدا بێت، نەك له دڵتدا! چەند له دەوڵەمەندەكانی ئەم وڵاته سەروەتەكانیان له دەستیاندایه؟ بێگومان ڕێژەیەكی زۆر كەم!

كەواتــه: * گــەر دەتەوێت بەختەوەر بیــت، ڕازیبه بەو گوزەرانه ســادەیەی كه تێیدا دەژی! هەرگیز سەیری كەسانی له خۆت باڵاتر مەكه، هەمیشه سەیری كەسانێ بكه كه له خوار خۆتەوەن!

* ئەگەر تۆ تەنها خانوویەكی ســادەت هەیه تێیدا دەژی، ئەوا كەســانێكی زۆر هەن لەم دونیایەدا خانوویەك شك نابەن له ناویدا بحەوێنەوە!

* ئەگــەر كرێنشــینی له خانووی كابرایەكی دەوڵەمەندا، ئــەوا بزانه ژمارەیەكی زۆری خەڵكی له شوقەو خێمەو تاقه ژوورێكدان، چونكه توانای كرێدانی خانوویان نییه!

* ئەگەر تۆ كەسێكی جلوبەرگی مۆدێرنو پێڵاوی گرانبەهات نییه، كەسانێكی زۆر هەن ئەندامەكانی جەستەیان نییه! وەكو زانایەك دەڵێت: (گریام بۆ خۆم، چونكه پێڵاوم نەبوو، كاتێك چوومه بازاڕ كه سانێكم بینی قاچیان نەبوو!).

* ئەگــەر هیــچ دارایــەكو مووچەیەكی مانگانــە، یاخود كارێكی هەمیشــەییت نییە، خەمبار مەبە، چونكە تۆ خاوەنی تاجی زێڕینی لەشســاغیت، كە گرانبەهاترین ســەروەتی ئــەم دونیایەیــە! چەندان كەس هەن ئیرەییت پێ دەبەن، چونكە ئەوان عەیامێكە لەســەر جێگە كەوتوونو توانای هەڵسانیان نییە!

* ئەگــەر تــۆ چاوەكانت كز بوونو بە چاویلكەوە ســەیری جوانی سروشــتو هاوســەرو منداڵەكانتو ئەم جیهانە دەكەیت، هێشــتا بەختەوەریت! چونكە كەســانێكی زۆر هەن هەر لە بنەڕەتدا نابینانو ئاواتەخوازن بۆ تەنها جارێك بزانن ڕەنگی خۆیان، باوكو دایكیان، خوشكو براكانیان... چۆنە! كەواتە گەر دەتەوێت بەختەوەربیت، بزانە كە قەناعەت ئەو مرواریيەیە كە لە ناخی دەریادایە، هەموو كەس ناتوانێ بیگاتێ، دڵنیابە هەر كەس بتوانێ بەدەســتی بهێنێ، دەبێتە بەختەوەرترین مرۆڤی ئەم سەرزەمینە، (قەناعەت گەنجینەیەكە، هەرگیز لە بن نایە)!



# قازی ئەبو یوسف!

قازی ئەبو یوسـف هەر لە تەمەنـی منداڵیدا باوکی ماڵئاوایـی یەکجاری لێکردو دنیای بەجێهێشـت، قازی ئەبو یوسـفو دایکی جگە لە خەموپەژارەی ئەو کارەساتە، بارودۆخی ژیانو لێپرسراوێتی ماڵیشیان کەوتە ئەستۆ، دایکی لە پێناوی پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانەیاندا، هەوڵیدا کوڕەکەی فێری پیشەیەك بکات، تا ئاتاجی دەستی کەس نەبن‌و نەبنە ئەرك بۆ سەرشـانی هیچ کەس، بۆ ئەم مەبەسـتە کوڕەکەی نارده لای وەسـتایەکی بەرگـدروو، تا فێری دروومان ببێتو ڕۆژانـەش چەند درهەمێك پەیدا بکات، بۆ بەڕێوەبردنی ژیانو گوزەرانیان.

ئیـدی لـەو ڕۆژە بە دواوە قـازی ئەبو یوسـف هەموو بەیانییـەك زوو دەچووە دووکانی بەرگدرووەکەو کاری لەگەڵدا دەکرد، ئێوارانیش تەنها یەك درهەمی شاگردانە وەردەگـرت، ئەویـش پارەکەی دەبـردەوە بۆ دایکی تـا خۆراكو پێداویسـتییەکانی ڕۆژانەیانی پێ بکڕێت.

چەند ڕۆژێك قازی ئەبو یوسف چووە لای بەرگدرووەکە، بەڵام قەدەر وابوو ڕۆژێکیان ڕێی کەوتە مزگەوتێك، بینی کۆمەڵێك قوتابی لە دەوری پێشەوا ئەبوحەنیفە کۆبوونەتەوەو سەرقاڵی موتاڵاکردنو خوێندنن، لێیان نزیکبووەوەو کەمێك گوێی بۆ قسەکانی مامۆستا ڕادێرا، بە وتەکانی زۆر سەرسام بوو، هەر بۆیە لە کۆڕەکەیاندا دانیشتو بڕیاری دا ئەو ڕۆژە نەچێتە لای بەرگدرووەکە، بۆ ڕۆژی دواتریش بەهەمان شێوە چووەوە بۆ لای پێشەوا ئەبوحەنیفەو ئامادەی وانەکانی بوو، بەرگدرووەکەش ئێوارە چوو بۆ ماڵی قازی ئەبو یوسفو سکاڵای نەهاتنی لای دایکی کردو پێی گوت: ئەوە دوو ڕۆژە کوڕەکەت نەهاتووە بۆ سەر کار، لەبەرئەوە منیش ڕۆژانەکەی دەبڕمو ئیدی چاوەڕانی کرێی کاری کوڕەکەت مەکە، بۆ ڕۆژی دواتر دایکی چوو بە شوێن کوڕەکەیدا تا بزانێت بۆ کوێ دەچێت، وا دوو ڕۆژە نەچووەتە سەرکار، بینی لە کۆڕی قوتابییەکانی پێشەوا ئەبوحەنیفەدا دانیشتووە، بە تووڕەییەوە دەستی گرتو مۆڵەتی لە مامۆستا خواست تا بیباتە دەرەوە!

پێشەوا ئەبوحەنیفە پێی گوت: دادەگیان من زیرەکییەکی بێ وێنە لە منداڵەکەتدا بەدی دەکەم، تکایە مۆڵەتی بدە با بخوێنێت، دڵنیابە ڕۆژێك دادێت کوڕەکەت خواردنی (فالوزەج) دەبێت، (فالوزەج جۆرێك بوو لە شیرینی لە ڕۆنی فستەق دروست دەکرا، لەو زەمانەدا جگە لە خەلیفە کەس لە توانایدا نەبووە ئەو جۆرە خواردنە بخوات)!

دایکی قازی ئەبو یوسف وەڵامی دایەوەو وتی: مامۆستا گیان تۆ بێ ئاگای لە حاڵی ئێمە، تکایە واز لە کوڕەکەم بهێنە، تەنها ئەم کوڕەمان هەیە ڕۆژانە درهەمێکمان بۆ پەیدا بکات.

بۆ ڕۆژی دواتر قازی ئەبو یوسف دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ لای پێشەوا ئەبوحەنیفەو نەڕۆیشت بۆ لای بەرگدرووەکە، پێشەوا زۆر حەزی دەکرد قازی ئەبو یوسف بەردەوام بێت لە خوێندن، چونکە قوتابییەکی زۆر ژیرو زیرەكو لێهاتوو بوو، بە داهاتووی زۆر گەشبین بوو، هەربۆیە لێی پرسی: کوڕی شیرینم، بەرگدرووەکە ڕۆژانە چەند درهەمت پێ دەدات؟

قازی ئەبو یوسف وتی: تەنها یەك درهەم.

پێشەوا وتی: من هەموو ڕۆژێك ٣٠ درهەمت پێ دەدەم، تا دایکت ڕازی بێت تۆ واز لە کارکردن بێنیتو درێژە بە خوێندن بدەیت. (پێشەوا ئەبوحەنیفە جگە لەوەی زانایەکی ناودارو بلیمەت بوو، لە هەمان کاتدا بازرگانێکی دەوڵەمەندو بەخشندە بوو)!

دایکیشی بەمجۆرە ڕازیبوو، کوڕەکەی لای پێشەوا ئەبو حەنیفە بخوێنێت.



ڕۆژان تێپەڕیو قازی ئەبو یوســف خوێندنی تەواو کــردو بووە زانایەکی بە ناوبانگی سەردەمی خەلیفە هارونە ڕەشیدو پۆستی قازی پێ درا!

پاشــان لەبەر لێهاتوویی قازی ئەبویوســف هارونە ڕەشید پۆســتی سەرۆکی دادوەرانی پێبەخشی!

جارێکیان قازی ئەبویوسف لەگەڵ هارونە ڕەشید پێکەوە لە سەر خوانێك دانیشتبوون، خواردن گەلێکی نایابو خۆش لەسەر خوانەکە دانرابوو، یەکێك لەو خواردنانە (فالوزەج) بوو، قازی ئەبویوسف کاتێك سەیری فالوزەجەکەی کرد، هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە.. خەلیفە پرسی: چی ڕوویداوە، بۆچی دەگریت؟

قازی ئەبو یوسف تەواوی چیرۆکەکەی بۆ هارونە ڕەشید گێڕایەوە!

خەلیفــەش وتی: ڕەحمەتی خودا لە پێشــەوا ئەبوحەنیفــە بێت، کە بە چاوی عەقڵی ســەیری داهاتووی تۆی کردووە، نەك بە چاوی ســەری! بەڕاستی هەر زانستە پلەوپایەی خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا بەرز دەکاتەوە!

پاشان قازی ئەبو یوسف وتی: ئەگەر ئەو کارەم بکردایە کە دایکم دەیویست، ئەوا ئێستا بەرگدروویەك دەبووم، بەڵام خودا ویســتی من ببمە زانایەكو لەگەڵ خەلیفەو ناوداراندا دابنیشمو لەسەر خوانی ئەوان نانبخۆم!

دایکی ئازیز، باوکی بەڕێز: تکایە بە چاوی ســەرتان ســەیری داهاتووی منداڵەکانتان مەکەن، بەڵکو بە چاوی عەقڵتان بۆ داهاتوویان بڕوانن..

ڕەنگــە ئەمڕۆ منداڵەکانت بتوانــن چەند دینارێکتان بۆ پەیدا بکــەن، بەڵام دڵنیابن ئایندەیان وێران دەبێت!

لەوانەیــە ئەمڕۆ کە پارەی شــاگردانەکەی وەردەگرێت، خۆشــحاڵ ببیو پێ بکەنیت، بەڵام سەرەنجام دەبێت هەموو تەمەنی نیگەران بیو فرمێسك بۆ ڕابردووی لە دەستچووی هەڵوەرێنێت! هەمووشمان دەزانین ئەو کات پەشیمانی دادمان نادات!

کەواتە ئێستا هانی منداڵەکەت بدە لەسەر فێربوونو زانستو زانیاری، کەشی خوێندنی بۆ فەراهەم بهێنە، چونکە هەر زانستە ئایندەی مرۆڤەکان گەشو ڕووناك دەکاتو دەبێتە هۆکاری بەختەوەری دنیاو دوارۆژیان..

ماڵوسامان لەناو دەچێت، بەڵام هەرگیز زانستو زانیاری لەناو ناچێت!



# هەستکردن بە بەرپرسیارێتی!

جارێکیــان پادشــای وڵاتێك فەرمانی بە پاســەوانەکانی کرد، بەردێکــی تا ئەندازەیەك گەورەو قورس لەســەر شەقامی سەرەکی شار دابنێنو لە ژێر بەردەکەدا دیارییەك دابنێن، دواتــر فەرمانی بە دووان لە پاســەوانەکان کــرد، لە دوورەوە چاودێــری بەردەکە بکەن، بۆئەوەی بزانن تا چەند هاوڵاتیان هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەنو گرفتو بەربەستەکانی شــارەکەیان بــە گرفتی خۆیان دەزانن، تا بزانن کێ ئامادەیــە تەنها کەمێك لە کاتی خۆی دەگرێت، بۆ لابردنی ئەو بەردەی کە بووەتە دروستکردنی نارەحەتی بۆ خەڵکی شارەکە...

بەردەکــە دانــراو پاســەوانەکانیش لــە دوورەوە چاودێریان دەکرد، هــەر کەس لەوێوە تێدەپەڕی، خۆی لادەداو ئامادە نەبوو بەردەکە لەسەر ڕێگەکە لاببات، کات لە نیوەڕۆ نزیك بــووەوە، بەڵام بەردەکە هەر لە شــوێنی خــۆی بوو، تەنانەت هیچ کــەس بەردەکەی تاقی نەکردەوە، ئاخۆ دەتوانێت بەردەکە لەسەر ڕێگەکە لاببات، یان نا؟

کەس بە گرفتی سەرەکی خۆی نەدەزانی، هەر کە دەگەیشتنە ئاستی بەردەکە، ڕێڕەوی خۆیــان دەگۆڕیو بــە لایدا تێدەپەڕین، هیچ کــەس ئامادەنەبوو کەمێــك لە کاتی خۆی بگرێتو بەردەکە لەســەر شەقامی ســەرەکی لاببات، چاودێری بەم شێوەیە بەردەوام بوو، زۆری نەمابوو خۆر ماڵئاوایی بکات، کات درەنگ بوو، بەردەکەش هەر لەسەر شەقام بوو.

درەنگانێك پیاوێك بەدەرکەوت، کاتێك گەیشــتە ئاســتی بەردەکــە، کەمێك لە بەردەکە

ڕاماو سەیرێکی ئەملاو لای خۆی کرد، کەسی بەدی نەکرد، چونکە کات دەمەو ئێوارەیەکی زۆر درەنگ بوو، پاشان قۆڵی هەڵماڵیو بە هەموو هێزی پاڵی نا بە بەردەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەردەکە زۆر قورس بوو، بەڵام هەر کۆڵی نەدا، بەردەوام بوو تا سەرەنجام توانی بەردەکە لەسەر شەقام دوور بخاتەوەو ڕێگەکە بە تەواوی بکاتەوە.

دوای ماندوو بوونێکی زۆر، پشتی بەرز کردەوەو هەناسەیەکی هەڵکێشا، سەیرێکی ئەو شوێنەی کرد کە بەردەکەی لێ بوو، لە ناکاو زۆر سەری سوڕما، دەزانن بۆ؟

چونکە لە ژێر بەردەکەدا چاڵێکی بچووك هەڵکەنرابوو، پارچەیەك زێڕی گرانبەهاو نامەیەکی تێدا بوو، کاتێك پارچە زێڕەکەو نامەکەی هەڵگرت، بینی لە نامەکەدا نووسراوە، ئەم پارچە زێڕە دیاری جەنابی پادشای وڵاتە، بۆ ئەو کەسەی ئەم بەردە لا دەبات.

لێرەوە فێردەبین کە هەستکردن بە بەرپرسیارێتیو گرنگیدان بە خەمی خەڵكو لابردنی ئاستەنگەکانی سەر ڕێگەیان، تەنها خەڵکی سوودمەند نابن، بەڵکو سوودمەندی یەکەم کەسەکە خۆیەتی، مەرج نییە هەموو کات لە لابردنی بەربەستی سەر ڕێگەکانو دەستگیرۆیی هەژارانو بێنەوایان، قازانجی ماددی بەدەستبهێنین، ئاسوودەیی ویژدانو ئارامی ڕۆح، زۆرگەورەترە لە خەڵاتە مادییەکان، بێگومان ئەم خەڵاتەش بە یارمەتیدانو هاوکاریو گرنگیدان بە چارەسەرکردنی خەمەکانی دەورووبەرو دۆستانو ئەزیزانت بە دەست دێت.

زۆرجار دەبیستین هاوڵاتیان، بە تایبەت ئەوانەی لە هەندەران دەگەڕێنەوە، باس لە پاکوخاوێنیو جوانی شەقامەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو دەکەن، ئەوەی جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە ئەوەیە کە پاکراگرتنی شەقامو کووچەو کۆڵانەکان دەبێت لە ئەستۆی کێ بێت؟

ئایا بە تەنها حکومەت لەو کارە بەرپرسیارە؟

بێگومان نەخێر! ئێمە دەمانەوێت شەقامەکانمان پاکوخاوێن بن، بەڵام ئامادە نین بەردێك، کاغەزێك... لەسەر شەقام هەڵگرینەوە، سەیرتر لەوەش ئەوەیە لە جامی ئۆتۆمبێلە ئاخر مۆدێلەکانەوە قوتوی ساردیو بتڵی ئاوو... هتد، فڕێ دەدرێتە سەرشەقامەکان!!

گەر هەمووان گرفتو کێشەکانی کۆمەڵگەکەمان بە گرفتی سەرەکی خۆمان بزانینو پێکەوە هەوڵی لابردنی بەربەستەکان بدەین.. ئەو کاتە دەبینە کەسێکی بە ویژدانو بەسوود بۆ خۆمانو کۆمەڵگەکەمان! شەقامو کۆڵانەکانی ئێمەش وەکو شەقامەکانی وڵاتان پاکوخاوێنو جوانو ڕازاوە دەبن!!



# چ سەردەمێكی سەیرە!!
# سەردەمی پێچەوانەكان

ئێمە لەســـەردەمێكدا دەژین كە پڕە لە كاری پێچەوانە، دەبینین ڕووكەش پێچەوانەی ناوەڕۆكە، واتاو ناوەڕۆك پێچەوانەن، وەكو ئەو نموونانەی ئەمڕۆ دەیانبینین:

* خانووبەرەی فراوانو كەمالیاتی زۆری ژیان، بەڵام خێزانی لەیەكترازاوو پەرتەوازە، لاوازبوونی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان.

* ژمارەیەكی زۆر لە هەڵگرانی بڕوانامەی ئەكادیمی، بەڵام هەژار لە دانایىو هاوسەنگی دەروونییدا.

* ژمارەیەكی زۆر لە پزیشــكی ڕاوێژكارو پســپۆڕ، بەڵام گرفتو كێشــەكان ژمارەیان زیاترەو نەخۆشییە كوشندەكان زۆرنو بەردەوام ڕوو لە زیادبوونیش دەكەن.

* سامانو داراییەكی  زۆرو چێژێكی كەم.

* خێرایی لەسەركردایەتیداو لاوازی لە كۆنترۆڵكردنی دەروونداا.

* خەوێکی پەشێوو هەستانێکی شێواو.

* پەرتوكو نوسراوی زۆر، بەڵام خوێندنەوەو خوێنەری زۆر کەم.

* کاتێکی زۆر بۆ سـەیرکردنی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن، بەڵام چەند خولەکێکی کەم بۆ شتە بەسودەکانو بیرکردنەوەو یادی خوداو سەرزەنشتکردنی دەروون.

* هەوڵدانێکی زۆر بۆ بەدەستهێنانی ماڵو سامان، نەبوونی کەمترین دەرفەت بۆ سودو چێژوەرگرتن لەو ماڵو سامانە.

* دەرکەوتنی ڕۆژانەی داهێنانو پێشکەوتنە زانستییەکان، بەڵام تەمەنێك بە بێ ژیانو ساڵانێك لە مردنی ڕۆحو دەروون.

* باڵەخانەی فرەنهۆمو بینای بەرزو ڤێللای قەشەنگو ڕێگاو بانی فراوان، بەڵام ئاسۆی تەسكو بیرۆکەی کرچو کاڵو بۆچوونی سادە.

* کەلوپەلو شتە بەنرخەکان زۆرن، بەڵام خۆشحاڵیو ڕەزامەندیو شادمانی زۆر کەمە.

* مرۆڤ ئاسـۆ دەبڕێو دەگاتە سـەرمانگ، بەڵام ناچێتە سـەردانی دراوسێکەیان کە دیوارییان بە دیواری یەکدییەوەیە!

* مرۆڤ وانەکانی گەردووونناسـی دەخوێنێو سـەردەکەوێت بۆ بۆشایی ئاسمان، بەڵام دەستەوەسـتانە لە تێگەیشـتنی خودی خۆی، ئەتۆم لەت دەکات، بـەڵام ناتوانێت زاڵبێت بەسەر ڕقوکینەو هەواو ئارەزووەکانیدا.

* ئەدیبێکی گەورەیەو هیچ فێرنابێت، ئەندازیارێکی گەورەیە، بەڵام بۆ دروسـتکردنی ژیانێکی هاوسەنگ شکستی خواردووە.

* پەلەکردنێکی بێ وەستانو سەروەتو سامانێکی زۆر، بەڵام دوور لە بەها ڕەوشتییەکان.

* کۆمپیوتـەری زەبـەلاحو کۆمەڵـە زانیارییەکـی زۆر، بـەڵام کەمتەرخەمـی لـە پەیوەندییەکاندا.

* گرنگیدان بەڕووکەشی شتەکان، بەڵام چاوپۆشین لە گەوهەرو ناوەرۆکی کارەکان.

* ژەمە خۆراکی خێراو هەرسکردنێکی خاو.

* پیاوانی بەهێز لە باسكو بازوودا، بەڵام لاوازو دەستەوەستان لە دەرووندا.

* دەوڵەمەند لە داراییدا، بەڵام هەژار لە ژیریدا.

* زۆری کاتەکانی بەتاڵیو کەمی کاتی شادمانی.
* خواردنی زۆرو بەتام، بەڵام بێسوودو بێ بەهای خۆراکی.
* ژنو مێردی لە یەکگەیشتوو لە ڕووکەشدا، بەڵام جیاواز لەبیروبۆچوونو ناوەرۆکدا.
* کۆشك گەلێکی بەرزو بڵند، بەڵام دڵانێکی خەمبارو تێکشکاو.

کەواتە خێرا دەست بکە بەسوودو چێژوەرگرتن لە ژیانت، بەختەوەریو خۆشحاڵی دوامەخە تەنها بۆ بۆنەکان، چونکە هەموو ڕۆژێکی نوێ بە سروشتی خۆی خاوەنی بۆنەیەکی تایبەتە، لەبەرئەوەی هێشتا لە ژیانداێ، سوودو چێژ وەربگرە لە هەموو ساتەکانی ژیانت.

زۆر بخوێنەرەوە داوای زانست بکەو بەدوایدا بڕۆ لە هەرشوێنێك بێتو لە لای هەرکەسێك بێت، شەرم مەکە لە دانیشتنەکانتدا لە ڕیزی پێشەوە دابنیشەو دەست بکە بە پرسیارکردنو لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون، تا دەگەیتە قوڵاییو ناوەرۆكو گەوهەری شتەکان.

زۆرترین کاتت لەگەڵ خێزانەکەتو هاوڕێکانتو خۆشەویستەکانتدا بەسەربەرە.

سەردانی هەموو ئەو شوێنانە بکە کە ئارەزووت لێیەتی، بەو مەرجەی بە هەڵسوکەوتت زیان بە کەسانی تر نەگەیەنیتو ڕەوشی کارەکەت پەك نەخەیت.

جلوبەرگە جوانو نایابەکانت لەبەر بکەو بۆنی بەهادارو نایاب بەکاربهێنە، ناخت هەرچۆنێك بێت جوانی تۆ دەردەخات، کەواتە ئەم شتانە هەڵمەگرە تەنها بۆ بۆنە تایبەتییەکان، بەڵکو ڕۆژانە بەکاریان بهێنە.

لە فەرهەنگی زمانەوانیتدا هەموو ئەو شتانە بسڕەوە کە بەڵگەن لەسەر دواخستنی کارەکەت، بیانگۆڕە بەو شتانەی هانت دەدات لەسەر پێشکەوتنو بەدەستهێنانو تاودانو گورسەندن.

خۆشەویستیت دەرببڕە بەبێ شەرمکردن، هاوکات خۆشحاڵیو بەختەوەریت دەرببڕە، بەبێ دوودڵیو ترس.. ئێستاو ئەم کاتە زۆر چاکترە لە (بەم نزیکانەو لە دواییدا) ئەمڕۆ هی تۆیە، بەڵام سبەی نادیارەو تەنها خودا دەزانێ چی ڕوو دەدات!




# هەڵەی کەسانی دی، دووبارە مەکەرەوە!

ئالوودە ببوو بە کڕینو فرۆشتنو بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، سەرەنجام دووچاری زیندان بوو، دادگا بە تۆمەتی بەکارهێنانو مامەڵەکردن بە ماددە هۆشبەرەکانەوە، فەرمانی زیندانی هەتا هەتایی بەسەردا سەپاند!

ئەمە چیرۆکی گەنجێکی تازە پێگەیشـتوو نییە، بەڵکو باسـی کەسێکە کە تەمەنی لە نێوان ٥٠-٦٠ سـاڵیدایە، خاوەنی ماڵو منداڵەو ئەزموونێکی لە ژیاندا هەیە، بە هەرحاڵ زۆر بەسـەر ئـەم ڕووداوەدا تێنەپەڕی، کوڕی یەکەمی بە هەمـان تۆمەت خرایە زیندان، ئەویش دادگا بە وێنەی باوکی فەرمانی هەتا هەتایی بەسەردا دا!

بـەڵام کوڕی دووەمی بە پێچەوانـەی باوکیو برا گەورەکەیەوە، قۆناغەکانی خوێندنی بە سـەرکەوتوویی تەواو کردو بوو بە بەڕێوەبـەری یەکێك لە کۆمپانیا بە ناوبانگەکانی شارەکەی!

توێژەرێکی کۆمەڵایەتی ویستی توێژینەوەیەک لەسەر ژیانی ئەم خێزانە ئەنجام بدات، سەرەتا چووە لای کوڕی یەکەم کە بە هەمان تۆمەتی باوکی خرابووە سووچی زیندان، لێی پرسی: هۆکاری گەیشتنت بە زیندان چی بوو؟

چاوەڕوان دەکەیت چ وەڵامێك بداتەوە؟!

زۆر بە ئاسایی وتی: لە کاتێکدا باوکم بە تۆمەتی مامەڵەکردنو بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان فەرمانی هەتاهەتایی لە زینداندا هەیە، ئیدی چ چاوەڕوانییەك لە من دەکرێت؟!

پاشان توێژەرەکە ڕۆیشت بۆ لای کوڕی دووەمی ئەو پیاوەو لێی پرسی: چۆن توانیت ببیتە بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمپانیا بەناوبانگەکانی ئەم شارە؟

لە وەڵامدا گوتی: باوکم ئالوودەی ماددە هۆشبەرەکان بوو، ئێستاش بەو تۆمەتە فەرمانی زیندانی هەتا هەتایی هەیە، ئیدی چ چاوەڕوانییەك لە من دەکرێت؟!

ئێستا با پێکەوە بیربکەینەوە، بە وردی سەرنج لەم دوو وەڵامە بدەین، هەمان وەڵام، هەمان ڕووداو، دوو کوڕی یەك خێزان، یەکەمیانی گەیاند بە هەمان شوێنی باوکیو دووەمیانی کردە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك!

دەزانم هەمووتان دەپرسین چۆن؟ وەڵامەکەی زۆر ئاسانە، کوڕی یەکەم وا بیری کردووەتەوە کە گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە، ئیدی هەر بۆیە بە هەمان ڕێچکەو ڕێبازی باوکیدا ڕۆیشتووەو هەمان سیناریۆی باوکی لە ژیاندا دووبارە کردووەتەوە، هەربۆیە دەڵێت: ئەگەر من کوڕی ئەو باوکە بم هەر ئەوەم لێ چاوەڕوان دەکرێت، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کە سەرەنجام دووچاری هەمان چارەنووسی باوکی ببێت!

«زۆرجار نەوەکان هەمان ئەو کارە دووبارە دەکەنەوە کە باوکیان ئەنجامی دەدات، بۆ وێنە ئەگەر باوکی کەسێکی جگەرەکێش بێت، ئەویش چاو لە باوکی دەکاتو دەبێتە کەسێکی جگەرەکێش، ئەگەر پێی بڵێی جگەرەکێشان زیانی زۆرە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ، بۆچی لەم تەمەنەوە دەستت داوەتە جگەرەکێشان؟ ڕەنگە لە وەڵامدا بڵێ ئەگەر جگەرەکێشان کارێکی خراپ بووایە باوکم نەیدەکێشا! خۆئەگەر باوکی خاوەنی سەدان ئاکاری جوان بێت، پێی بڵێی ئەی بۆچی تۆش وەکو باوکت ئەو کارە چاکانە ئەنجام

نادەیـــت، لە وەڵامدا دەڵێت: مـــن ناتوانم وەکو باوکم ئەو کارانە ئەنجام بدەم، بە داخەوە زۆرێك لە منداڵان تەنها لە شتە خراپەکاندا چاو لە باوانیان دەکەن»!

بەڵام کوڕی دووەم، کاتێك دەڵێت: چ چاوەڕوانییەك لە من دەکرێت، مەبەستی ئەوەیە کـــە نابێت من بە هەمـــان ڕێبازو ڕێچکەی باوکمدا بڕۆمو هەمـــان هەڵەو مێژووی باوکم دووبارە بکەمەوە، بە پێچەوانەوە من پەندم لە ژیانی باوکم وەرگرت، لە دوای بەندکردنی باوکـــم بە هەر دەردەســـەرییەك بێت خوێندنم تەواوکردو دواتر لـــەم کۆمپانیایە بوومە کارمەندو پاشان بە هۆی دڵسۆزییو لێهاتوویم لە کارەکەمدا پلەی بەڕێوەبەرم پێبەخشرا!

مرۆڤـــی ژیر هیچ کات بە ڕێگایەکدا ناڕوات کە لە پێش ئەوەوە کەســـانێکی دووچاری ڕۆژگارێکی تاریكو ناهەموار کردووە، بەڵکو لەوانە پەندوەردەگرێتو هەڵەی کەســـانی دی دووبارە ناکاتەوە، ئەگەرچی نزیکترین کەسیشی بێت!

لێـــرەوە بۆمـــان دەردەکەوێت، کە مەرج نییە ئەو کەســـەی خـــۆی خراپەکارەو ڕێگەی هەڵـــەی گرتووەتە بەر، نەوەکانیشـــی هەمان هەڵەو ســـیناریۆ دووبـــارە بکەنەوەو لە نێو کۆمەڵگەدا بە چاوێکی کەم سەیریان بکرێت، بەڵکو دەگونجێت نەوەکانی ئەو کەسە وەکو کـــوڕی دووەمی ئەم پیـــاوە دوور بکەونەوە لە ڕێبازی خراپو مێـــژووی باوانیان دووبارە نەکەنەوە، لە هەمان کاتدا کەســـانی زیرەكو بە ئەزمـــوونو لێهاتوویان لێ دەربچێت، کە بتوانن خزمەتی خۆیانو وڵاتو شارەکەیان بکەن.

بەو هیوایەی هەمووومان چاو لە شتە باشەکان بکەینو لە خراپەکان دوور بکەوینەوە!

سێ لاو بۆ کاروباری بازرگانی گەشتیان کرد بۆ وڵاتێکی دوور لە زێدی خۆیان، کاتێك گەیشتنە شوێنی مەبەست، بۆ پشوودانو مانەوەیان روویان کردە میوانخانەیەکی زۆر راقیو پێشکەوتوو، کە لە ٧٥ نهۆم پێکهاتبوو، هیچ جێگەیەك نەمابوو جگە لە نهۆمی ٧٥، فەرمانبەری پێشوازی پێی وتن: یاسای ئێمە لەم وڵاتە جیاوازە لە وڵاتی ئێوە..

(ئاسانسـور) مەسـعەدی میوانخانەکە پرۆگرامسـازەو بەشـێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کاتژمێر (١٠)ی شـەو دادەخرێت، پێویسـتە بەرێزتان پێش ئەو کاتە، واتە پێش ١٠ی شـەو ئامادەبن، لەبەرئەوەی ئەگەر مەسـعەدەکە داخرا، ناتوانرێت بکرێتەوە، چونکە بەپێـی بەرنامـەی کۆمپیوتەری کار دەکات لە شـوێنێکی دوور لە ئێمەوە فەرمان بە داخستنی دەکرێت، تێگەیشتن؟!

هەموو گوتیان: بەڵێ تێگەیشتین.

رۆژی یەکەم، بۆ گەشتو گوزار چوونە دەرەوە..

پێش کاتژمێر (١٠)ی شـەو گەیشـتنەوە میوانخانەکە، چەند رۆژێك بەمشێوەیەو لە کاتی دیاریکراودا دەگەیشـتنەوە میوانخانەکەو هیـچ گرفتێکیان بۆ نەهاتە پێش، بەڵام رۆژێکیان کە لە گەشـتێکی زۆر خۆشدابوون، سیمای جوانیو رازاوەیی ناوچەکە سەرسـامی کردبـوون، هەربۆیە ئاگایـان لە کات نەماو درەنگیان بەسـەرهات، کاتێك گەرانەوە بۆ میوانخانەکە، تەنها پێنج خولەك بەسـەر کاتی دیاریکراودا تێپەری بوو، بینیان مەسـعەدەکە داخراوە، ماوەیەك بە بێدەنگی مانەوە، پاشـان پێکەوە راوێژیان کـردو برپاریانـدا کە لە رێگەی پلیکانەکانەوە برۆنە سـەرەوە بـۆ نهۆمی ٧٥، رێگە چارەیەکی دیکە نەبوو، جگە لەسەرکەوتن بەسەر پلیکانەکاندا، ئەویش کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە وەك لە سـەرەتاوە باسـمان کرد ئەوان شوێنی حەوانەوەیان لە نهۆمی ٧٥ بـوو، خـۆ ئەگەر هەر نهۆمێك تەنها لە ١٥ پلیکانەش پێکهاتبێت، ئەوا دەبێت ١١٢٥ پلیکانە ببرن تا دەگەنە شوێنی خۆیان!!

یەك لە لاوەکان وتی: پێشـنیارێکم هەیە، با هەر یەکێکمان شـتێك بگێرێتەوە کە ماوەکەی تا ٢٥ نهۆم بخایەنێت، پاشـان کەسـی دووەم بۆ ٢٥ نهۆمی دووەمو کەسـی سێیەمیش بۆ ٢٥ نهۆمی کۆتایی.. بەمشێوەیە بە ئاسانی بە دەم قسەکردنەوە دەگەینە

ژوورەکەی خۆمان، وتیان پێشنیارێکی زۆر جوانە، بفەرموو بە پشتیوانی خودا سەرەتا خۆت دەست پێبکە.

وتی: زۆر باشـــە من ســـەرەتا دەستدەکەم بە گێڕانەوەی نوکتەو قسەی خۆش تا لە پێکەنینا بپچڕێن، ئەوەندە پێبکەنن، کە خەمی دووری ڕێگەتان بیربچێتەوە!

وتیان: ئێمەش ئەوەمان دەوێت.

دەســـتیکرد بە گێڕانەوەی نوکتەو قسەی خۆش، تا ئەوەندە پێکەنین وەکو شێتیان لێهاتبـــوو، توانـــای کۆنترۆڵی خۆیان نەمابوو.. نهۆمەکان بە پێکەنینی ئەم ســـێ لاوە دەنگی دەدایەوە.

پاشـــان سەرە گەیشتە سەر کەســـی دووەم، ئەویش وتی: من ئەوەند چیرۆکم لایە کـــە ڕێگەکە بە بەراورد بە چیرۆکەکانم ڕێگەیەکی کورتە.. وتیان زۆرباشـــە، فەرموو دەست پێبکە، ئەویش دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆك تا ٢٥ نهۆمی دووەم تەواوبوو..

پاشـــان نۆرە گەیشتە سەر کەسی سێیەم: من هیچ شتێکم لانییە جگە لە چیرۆکی پڕ لە خەمو پەژارەو ناڕەحەتییەکانی ژیان.

لە کاتێکدا ئێوە گوێبیستی نوکتەو قسەی خۆشو چیرۆکی نایاب بوون.

وتیان: بفەرموو، دەســـت پێبکە، برا گەورەکەمان، ئیدی کەســـی سێیەم دەستی بە گێڕانەوەی خەمەکانی کرد، بەڵام هەمووان خەو زۆری بۆ هێنابوون...

بەدەم گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانەوە، هەر چۆنێك بێت گەیشتنە نهۆمی ٧٥، چوونە بەردەم ژوورەکەی خۆیان، زۆر ماندووببوون، کاتێك ویستیان بچنە ژوورەوە، دەرگاکە بکەنەوە، کلیلەکە بە کامتانە، کەسی یەکەم: بە من نییە، کەسی دووەم بە منیش نییە، کەسی سێیەم: بەداخەوە بیرمانچووە کلیلەکە لای فەرمانبەری پرسگەکە بهێنین!!!

ڕەنگە هەمووان سەرزەنشـــتییان بکەیـــن، بۆ دەبێت کلیلەکانیـــان بیرچوبێت؟؟ کەواتە تۆ هەوڵبدە کلیلەکان لە یاد نەکەی!!

ئێستا با بزانین ئەو سێ لاوە کێ بوون؟؟

ئـــەو ســـێ لاوە هەر یەکێك لـــە ئێمەین، بەم ڕۆژگارە ســـەرقاڵین بە یاریو گاڵتەو گەپەوە..

کەسی یەکەم، واتە: تا تەمەنی ٢٥ساڵی ئاگامان لە ژیان نییەو بە بیانووی هێشتا گەنجین، سەرقاڵی گێڕانەوەی نوکتەو قسەی پێکەنیناویو بە هەدەردانی کاتە زێڕینەکانی ژیانمانین.. لە کاتێکدا ئەو قۆناغە جوانترین تەمەنە بۆ مرۆڤ، بەداخەوە مرۆڤ کەمتر لەم تەمەنەدا بە ژیریو لێهاتوویی کار دەکات..

دواتر قۆناغی دووەمی ژیان دەستپێدەکات، کە بریتییە لە هەوڵدانو دروستکردنی ژیانێکی نوێ، گەڕان بە دوای دروستکردنی ژیانی هاوسەریدا، پەیداکردنی بژێویو پەروەردەکردنی منداڵو... کاروبارەکانی ژیان.. تا تەمەنی پەنجا ساڵی..

پاشان ٢٥ ساڵی کۆتایی ژیان دەست پێدەکات..

هەروەکو پێغەمبەری ئازیز (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: تەمەنی ئوممەتەکەم لە نێوان شەست بۆ حەفتا ساڵیدایە!

لەم تەمەنەدا مرۆڤ هەموو ئەو سەروەتەی بە دەستیهێناوە خەرجی دەکات، لە پێناوی گێڕانەوەی تەندروستی، هەر لەم تەمەنەدا مرۆڤ بەردەوام خەم لە ئایندەی نەوەکانی دەخوات، نێوانی ئەوو دۆستانی ڕوو لە گرژیو ئاڵۆزی دەکات، دووچاری کێشەی گەورەو سەخت دەبێتەوە.

دژایەتی نێوان ژنو مێرد دەست پێدەکات، زۆرجار قەرز لەسەری کەڵەکە دەبێت! تا ئەو کاتەی مردن یەخەی پێدەگرێت!!

ئێستا بیربکەرەوە.. دەزانیت ئەو کلیلەی بیرت چووە، کام کلیلەیە؟

ئەوە کردەوەی چاکی مرۆڤە، کە لە ژیاندا فەرامۆشت کردووە، کاتێك دەگەیتە دوا مەنزڵگات بیر دەکەیتەوە کە دەبوا هەر لە سەرەتاوە بیرت لە چاکەکاری بکردایەتەوەو درێغیت لە ئەنجامی چاکەکردن نەکردایە، چونکە دڵنیابە کاتێك دەگەیتەوە بە شوێنی حەوانەوەو پشوودانی هەمیشەیی، دەرگاکان بەبێ ئەو کلیلە ناکرێنەوە! کاتێك مرۆڤ لە تەمەنیدا، بە ئیفلاسیو دەستی خاڵی دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار، ئەو کات بیری دەکەوێتەوە کە هیچ کردەوەیەکی باشی نەکردووە بۆ کردنەوەی دەرگاکە، توێشوویەکی پێ نییە، تا لەبەریدا بحەوێتەوە، بەهەگبەیەکی خاڵییەوە کەوتۆتە ڕێ!!

ڕۆژێکیان مامۆستایەك لەبەردەمی قوتابییەکانی ڕاوەستاو پرسیارێکی زۆر سەیری ئاڕاستە کردن..

مامۆستا: ڕۆڵەکانم، ئایا ئێوە من دەبینن؟

قوتابییەکان: بەڵێ مامۆستا..

مامۆستا: کەواتە من بوونم هەیە، چونکە دەبینرێم..

قوتابییەکان: بەڵێ مامۆستا.

پاشان مامۆستا وتی: ئایا ئەم پێنوسە دەبینن؟



قوتابییەکان: بەڵێ مامۆستا!

مامۆستا: کەواتە ئەو پێنووسەش بوونی هەیە، چونکە دەبینرێت.

قوتابییەکان: بەڵێ مامۆستا!

دواتر پرسی: ئایا ئێوە خودا دەبینن؟

قوتابییەکان: نەخێر مامۆستا.

مامۆستا وتی: کەواتە خودا بوونی نییە، چونکە نابینرێت!

قوتابییەکان: زۆرسەرسام بوون، ماوەیەك بە بێدەنگیو سەرسامی دانیشتنو هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە..

لەناکاو قوتابییەکی زیرەك هەڵساو وتی: ئایا ئێوە ئەم پێنووسە دەبینن؟

هەموو وتیان بەڵێ..

پاشان پرسی: ئایا ئەم کتێبە دەبینن؟ دووبارە وتیان: بەڵێ دەیبینین..

دواتر پرسی: ئایا کەس لە ئێوە عەقڵی مامۆستا دەبینێت؟

هەموو وتیان: نەخێر!

قوتابیەکە وتی: ئەگەر شتێك نەبینرێت، مانای وابێت بوونی نەبێت، کەواتە مامۆستا عەقڵی نییە، واتە شێتە!

قوتابییەکان: بەم وەڵامە ژیرانەیە هەموو دەستیان کرد بە پێکەنینو زۆر خۆشحاڵبوون..

منداڵێك کە تەمەنی نەدەگەیشتە تەنها (١٢) ساڵ، سەلماندی بۆ مامۆستاکەی، کە خودا بوونی هەیە.. مرۆڤی ژیر لە هەموو گەردیلەیەکدا دەسەڵاتی خودا دەبینێ، چ جای وردبوونەوەو تێڕامان لە وردەکاریو گەورەیی ئاسمانەکانو زەویی، وردبوونەوە لە زیندەوەرانو چۆنییەتی ڕێکخستنی ژیانیان.. ئاڵۆزیو وردەکاری جەستەی مرۆڤ خۆی.. هاتنی شەوو ڕۆژ، ئەوانەو هەزارەها بەڵگەی دیکە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم گەردوونە لە خۆیەوە دروست نەبووە، بەڵکو خودایەکی بە تواناو بە دەسەڵات، سەرجەمی ئەو شتانەی دروستکردووە!

لەســـەرەتای تەمەنمـــەوە.. بەردەوام هەوڵـــم دەداو خۆم ماندوو دەكـــرد، بۆئەوەی لە قوتابخانە سەركەوتوو بمو لە زانكۆ وەربگیرێم..

دوای ئـــەوە هەوڵم دەداو خۆم ماندوو دەكردو شـــەونخونیم دەكرد، بۆئەوەی زانكۆ بە ســـەركەوتوویی تەواو بكەم، تا دوای ئەوە بچمە سەر كارو بتوانم بژێوییەك پەیدا بكەمو لە گیرفانی خاڵی ڕزگارم بێت..

پاشان بەردەوام هەوڵم دەدا بۆئەوەی كەسێكی شیاوو گونجاو بدۆزمەوەو هاوسەرگیری لەگەڵدا بكەم.. تا پێكەوە بتوانین نەوەیەك بخەینەوەو ببینە خاوەنی منداڵو جگەرگۆشە...

پاشان لە چاوەڕوانیدا گیانم ئەدا تا منداڵەكانم گەورە ببنو فێرببنو كەسانێكی باشی نێو كۆمەڵگەیان لێ دەربچێتو بەسوود بن بۆ خۆیانو كۆمەڵگەكەیان..

ئێستا من دەتوانم جارێكی تر بگەڕێمەوە بۆ سەر كارەكەم...

بەڵام خەمم بۆ ئەوەیە بە مووچەیەكی باش خانەنشین ببم...

ئێستاش هەر وایە لەسەر جێگە كەوتوومو چاوەڕوانم مەرگ ببێتە میوانم...

لە ناكاودا زانیم، كە من بیرم چووە لەم دنیایەدا بژیم...

تكایە... تكایە هەر ئێستا ڕازی بە، بە بارودۆخی ژیانت، هەر چۆنێكە...

چێژ لەم ساتەوەختە وەربگرە...

هەموو ڕۆژێك بە ڕۆژی خۆت بزانە... نەخەم بۆ ڕابردوو بخۆ.. نەترسیشت لە ئایندە هەبێـــت، ئەمـــڕۆ موڵكی تۆیەو بەس، دوێنێ ڕۆیشـــتو ناگەڕێتەوە، ســـبەینێش هەر خوا دەزانێت تۆ پێی دەگەیت، یان نا؟!

ئێمەی مرۆڤ هەموو ژیانو هەموو تەندروســـتیمان بەســـەردەبەین بۆ بەدەستهێنانی ماڵو سامان...

لە پاشاندا بۆ گێڕانەوەی تەندروستیمان، هەموو ماڵەكەمان خەرج دەكەین..

لە ژیاندا دەژین، وەكو ئەوەی هەرگیز نەمرین...

كاتێكیش چركەساتی مەرگ بەرەو ڕوومان دێت، وادەزانین تەنها ڕۆژێكیش لەم ژیانەدا نەژیاوین...

# بەڵام

## بە

## مەبە

* وەکو تیشکی خۆربە، چەند درەوشاوەیە لە نێوان هەورەکانو ناوەڕاستی ئاسماندا!

* وەکو مێرووله ڕەشە مەبە، لە شەوێکی تاریکدا.

* وەکو ئەو پەپوولەیە وابە کە بە ناو باخچەو گوڵو بێستانەکاندا دەفڕێت، بۆئەوەی زیاتر جوانی ببەخشێت بە سروشتی جوانی باخچەو گوڵەکان.. یاخود وەکو هەنگ بە، کە دەفڕێت لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ، بۆئەوەی هەنگوینێکی پاڵفتەو بەتام دروست بکات، کە پڕە لە شیفاو دەرمانی دەردەکان.

* بـــەڵام هەرگیـــز وەکو مێش مەبە، کە بەردەوام لە ســـوڕانەوەدایە بۆ بڵاوکردنەوەی دەردو نەخۆشییەکان.

* ببە بە کەسێکی پۆزەتیفو ئەرێنیو کاریگەر لەسەر کەسانی دەوروبەرت، بە پێی توانا!

* بەڵام هەرگیز مەبە بەو کەسەی کە کەسانی دەوروبەر، بە نەرێنیو خراپەکاری تێدەگەن.

* ببە بە کەسێکی بەخشندە، بەردەوام حەز بە بەخشین بکە، جوانتریش لەم سیفەتە ئەوەیە چاوەڕوانی پاداشتی بەخشینەکەت لە خەڵکی نەکەیت.

* هەرگیز مەبە بەو کەسەی بووە بە بەندەی دۆلارو دینار.

* ببە بە کەسێکی ئازاو نەبەردو چاونەترسو بەهێز!

* مەبە بە کەسێکی ترسنۆکو سەرشۆڕو لاواز.

* ببه بەو درەختەی کە هەمیشە خەڵکی لە بەرهەمەکەی دەخۆنو لە سێبەریدا دەحەوێنەوە.

* مەبە بەو درەختەی کە جگە لە زیان سوودی  دیکەی نییە.

* ببە بەو مرۆڤەی، پێش ئەوەی هەرهەنگاوێك بنێت، ڕاوێژ بە ژیری خۆی دەکات.

* مەبە بەو مرۆڤەی لە هەموو بڕیاردانێکدا هەمیشە گوێڕایەڵو شوێنکەوتەی هەواو ئارەزووەکانییەتی.

* ببە بە مرۆڤێکی ژیرو هاوسەنگو دەستپاكو زمانپاك، کە هەمیشە قسەی نەستەقو دەستەواژەی جوان، پێشکەش بە هاوڕێو دۆستانی دەکات.

* مەبە بەو مرۆڤەی لاوازو ناپەسەندو بێ متمانەو زۆربلێیە.

* ببــە بــە مرۆڤێکی فریشتەئاســا لە نێــوان مرۆڤەکاندا، کە هەمیشــە بە پەنجەی دەستیان ئاماژەی چاکەخوازی بۆ دەکەن.

* مەبە بەو مرۆڤەی خەڵکی هەمیشــە بە دەســتەکانیان ئاماژەی بۆ دەکەنو دەڵێن: ئەگەر ئەو نەبوایە بارودۆخمان زۆر باش دەبوو.

* ببە بەو مرۆڤەی لە کاروبارەکانیدا کەسێکی هێمنو لەسەرخۆیە.

* مەبە بە مرۆڤێکی هەڵەشە، کە زۆربەی کارەکانی بە زیان بەسەریدا دەشکێتەوە.

* ببە بەو مرۆڤەی بیر لە ژیانو بەهرەی ژیری دەکاتەوە، چونکە خودای گەورە، بە ژیریمان لە تەواوی دروستکراوەکانی دیکە جیایکردوینەتەوە.

* مەبە بەو مرۆڤەی بە دەستی خۆی عەقڵی خۆی لە دەست دەدات!

* ببە بە مرۆڤێکی ئارامگرو خۆڕاگر، ئارام بگرە لەسەر نەخۆشیو ناخۆشی، ئارامبگرە لەسەر بەڵاو نارەحەتی، چونکە ئارامگرتن کلیلی هەموو دەرگاکانە.

* مەبە بە مرۆڤێکی بێ ئارامو بێ تەحەممول، کە هەردەم دەم بە سکاڵایە بەرامبەر ڕووداوەکانی ژیان.

* ببە بە کەســێکی ڕێکوڕاستو یەك ڕوو، لەبەردەم خودای گەورەداو پاشان لەبەردەم خۆتو خەڵکیدا..

* هەرگیز مەبە بەو کەسەی شەرمەزاری لای خوداو پاشان خەڵکیشە.

* ببە بە مرۆڤێکی گەشبینو خاوەنی بیروڕای جوان، ئەو کات دنیا بە جوانی دەبینیت.

* مەبە بە مرۆڤێکی ڕەشبینو خاوەن بیرۆکەی خراپ، چونکە دنیات بەوشێوەیە دێتە پێش چاو!

# خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە

## خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە..

ئـای دڵـی منداڵەکان چەندە جوانن، چەندە پاکن، چەنـد بێ تاوانو بێ گوناهن، چەندە میهرەبانو بەسۆزن، ئەوان هێشتا خراپەو تاوان دڵەکانی ڕەق نەکردوون، دنیاپەرستی دڵەکانی پڕ نەکردوون.. تەماحو چاوچنۆکی بۆ گەیشـتن بە کورسیو پلەو پایەو دەسەڵات، چاوەکانی کوێـر نەکردوون، پیـلانو فێڵو تەڵەکەو ناپاکی، مێژووی ڕەش نەکـردوون.. ئەوان دڵپاکو دڵسافو پاکو بێگەردن، ئەو منداڵەی ئەمڕۆ ئازاری دەدات، سبەینێ دەست لە ملی دەکات..

## خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە..

بە هەڵهاتنی هەر ڕۆژێکی نوێ، منداڵ لە خەوهەڵدەسـتێ، هەموو ئەو شـتانەی کە لە ڕابـردوودا ڕوویان داوەو تەنانەت ئەوەش کە دوێنێ ڕووی داوە لە بیری دەچێتەوە.. هەر کـەس کە دوێنێ ئازاری دابێت، هەر شـتێك کە بووبێتە هـۆی نیگەرانکردنی، لە پەڕاوی مێشکیدا سڕاوەتەوە، ئەو لەگەڵ هەڵهاتنی ڕۆژێکی نوێ، دەست بە گاڵتەو گەپو یاریکردن دەکات، نە ڕابردوو نیگەرانی دەکات، نە لە ئایندەش دەترسێت..



## خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە..

منــداڵ زۆر بــە ئاســانی ڕازی دەبێت.. کاتێك تــوڕە دەبێتو فرمێســکەکانی جۆگەلە دەبەستن، بە پارچەیەك شیرینی، یان ساردەمەنییەك ڕازی دەبێتو ژیر دەبێتەوە، لە بری فرمێسكو گریان، زەردەخەنەیەکت پێشکەش دەکات..

چاکترینو جوانترین دڵ، ئەو دڵە بچووکانەیە کە بۆ خۆشەویستی ژیان لێدەدات، ئەو دڵانەی لێوان لێوە لە خۆشەویستی دەوروبەری، ئەو دڵانەی نازانن ڕقو کینە چییە، نازانن ڕژدیو بەخیلی چییە..

## خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە..

منداڵ حەز بە بەردەوامیو دامەزراویو سوربوون دەکات، کاتێك ڕادەوەستێت، چەندین جار هەوڵدەدات، بۆئەوەی دەستبکات بە یەکەم هەنگاویو بە خێرایی بە ڕێدەکەوێت، ئەو کاتەش کە زۆر بە خێراییو لە ناکاو ڕادەوەستێتو هاوسەنگی خۆی لە دەستدەداتو دەکەوێتە ســەر زەوی، ئەو بەهێزترو بە ویســتو ورەبەرزییەکی باشــتر لە جاران هەڵدەســتێتەوە، بێئەوەی هەســت بە خەمباریو ماندووبوونو بێزاری بکات، دەســتدەکاتەوە بە ڕۆیشــتن، ئەگەر بۆ جاری دووەم کەوتەوە ســەرزەویو هەســتی بە ئازارێکی زۆر کرد، دەگریو هاوار دەکات، بەڵام دوای ئەوەی فرمێسکەکانی سڕی، هەموو ئازارەکانی لە بیردەچێتەوە، جارێکی تر بە گوڕوتینێکی نوێوە هەڵدەســتێتەوە، هەمیشە هەوڵدەدات بەردەوام بێت لە ڕۆیشتن، هەرچەندە منداڵە، بەڵام هەرگیز نازانێت بێهیواییو نائومێدی چییە!!

## خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە..

گەورەتریــن خــەمو پەژارەی منداڵ، ئەو کاتەیە کە دەبینێت کەســێك، یارییەکانی لێ زەوت کردووە، یاخود منداڵێك دەبینێت خاوەنی جۆرە یارییەکە کە ئەم ئاواتەخوزاە ئەو جۆرە یارییەی هەبووایە، بەڵام تا ئێستا نەیتوانیوە بەدەستی بهێنێت..

پێــش ئەوەی بخەوێــت زۆر بە قوڵی بیر لەو یارییە دەکاتەوە، خەوی پێوە دەبینێت.. گەورەتریــن دەســتکەوتی ئەو ئەوەیە کە ببێتە خاوەنی ئــەو یارییە، ئەوەش گەورەترین خەمی دەبێت..

## خۆزگە دڵی ئێمەش، وەکو دڵی ئەوان بووایە..

ئەوپەڕی هیواو ئاواتی، گرنگترین ئامانجی.. ئەوەیە کە ببێتە خاوەنی کۆشکێك پڕ لە یاریو دیاری، ماڵێك لە کارتۆنو مقەبا دروستکرابێت..





# بۆ هەموو باوکێکی سەرقاڵ!

وەکــو نەریتی هەمیشــەیی خۆی باوکــی درەنگ گەڕایەوەماڵەوە، لەگەڵ ئەوەشــدا زۆر ماندوو شــەکەت بوو، لە کاتی گەڕانەوەیدا چاوی بە منداڵە بچوکەکەی کەوت لەبەردەرگای ماڵەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکرد، باوەشــی بە منداڵە چاوگەشــەکەیدا کردو دوای سڵاو منداڵەکەی گوتی: بابەگیان دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم؟

باوك: بەڵێ فەرموو، زۆر ئاساییە!

منداڵەکە پرسی: لە کاتژمێرێکدا چەند دۆلارت دەستدەکەوێت؟

باوکەکە بە توڕەییەوە وەڵامی دایەوە: ئەمە پەیوەندی بە تۆوە نییە، چی وای لێکردیت ئەم پرسیارە بێ مانایە بکەیت؟

منداڵەکە بەو پەڕی ئارامییەوە وەڵامی دایەوە: تەنها دەمەوێت بزانم، تکات لێدەکەم پێم بڵێ داهاتەکەت چەند دۆلارە لە کاتژمێرێکدا؟

باوکــی زۆر دڵتەنگ بوو بەو پرســیارە، بــەڵام بە ناچاری وەڵامی دایــەوە: ئەگەر هەر سووری لەسەر ئەوەی کە بزانیت، داهاتەکەم لە کاتژمێرێکدا تەنها (٢٠) دۆلارە.

منداڵەکەی بیری کردەوەو وتی: ئایا دەتوانیت (١٠)دۆلارم پێ بدەیت؟

باوکی بە توڕەییەوە وتی: ئەم پرسیارەت بۆ ئەوەبوو تا بزانیت لە کاتژمێرێکدا چەند دۆلارم دەستدەکەوێت، تا (١٠) دۆلارت پێبدەمو تۆش بە کڕینی شتی بێ سوودو شیرینی خەرجی بکەیت، بڕۆ بۆ ژوورەکەی خۆتو بخەوە، چونکە من بە درێژایی ڕۆژگار کاردەکەمو زۆر ماندوو بێتاقەتم، کاتم نییە بۆ ئەم پرسیارە هیچو بێ مانایانە.

منداڵەکە هیچ قسەی نەکرد، زۆر بە هێمنی بەرەو ژوورەکەی بەڕێکەوت، بۆ ئەوەی داواکەی باوکی جێبەجێ بکات!

باوکی لە ژوورەکەی خۆی دانیشت، سەرەتا زۆر نیگەرانو توڕە بوو، بەڵام دواتر کەمێك ئارام بووەوەو لەبەرخۆیەوە دەیگوت: چۆن بەو شێوازە ناشیرینە وەڵامی منداڵەکەم دایەوە، لە بەرامبەر داواکردنی چەند دۆلارێك؟ دوای چەند ساتێك باوکەکە کەمێك بیری کردەوە لەو گفتوگۆیەی کە لە نێوان خۆیو منداڵەکەیدا ڕوویدا، پاشان هەستیکرد کە دڵڕەق بووە بەرامبەر منداڵەکەی، لەوانەیە منداڵەکەی پێویستی بەو بڕە دۆلارە بووبێت! بە تایبەت ئەم منداڵە زۆر بە دەگمەن نەبێت داوای پارە ناکات! دەبێت منداڵەکە ئەو پارەیەی بۆ چی بووبێت، ڕاستەوخۆ باوکەکە بەرەو ژووری منداڵەکەی ڕۆیشتو دەرگاکەی کردەوە، پاشان پێی گوت: ئازیزەکەم نەخەوتووی؟ منداڵەکەش وتی نەخێر بابە گیان، نەخەوتووم.

باوکەکە وتی: بمبورە بەڕاستی من دڵڕەق بووم لەگەڵتدا، بە درێژایی ئەمڕۆ ماندوبووم فەرموو ئەمەش ئەو بڕە پارەی داواتکرد.

منداڵەکە بە دڵێکی خۆشو ڕوویەکی گەشەوە وتی: زۆر سوپاس بابەگیان.. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو ئەوەبوو کە منداڵەکەی بینی بڕێك پارەی تری لە ژێر سەرینەکەی دەرهێناو لەگەڵ ئەو پارەیەی کە ئەم پێی دابوو دەستیکرد بە ژماردنی! گەیشتبووە ئەو بڕەی کە منداڵەکە مەبەستی بوو!

بەڵام باوکی جارێکی تر توڕە بوو، لەبەرئەوەی منداڵەکەی داوای پارەی لێکردو پارەشی پێبوو، بۆیە پێی وت: بۆچی داوای پارەت لە من کرد لە کاتێکدا خۆت پارەت پێیە؟

منداڵەکەش زۆر بە دڵێکی پاکەوە وتی: پارەکەی من کەم بوو، بۆ ئەو کارەی کە مەبەستمە بەشی نەدەکرد، بەڵام ئێستا بووم بە خاوەنی (٢٠) دۆلار! لەبەرئەوە بابەگیان دەمەوێت یەك کاتژمێر لە کاتت بکڕمو پێکەوە بەسەری بەرین!

# شەڕی نێوان خەمو خۆشی!



خەم: سڵاو ئەی ئەو کەسەی بەشەوو بە ڕۆژ بەسەرکەوتنەکانت بێزارم دەکەیت.

خۆشی: سڵاو لە تۆش، کە هەمیشە بە فرمێسکو گریانت بێزارم دەکەیت!

خەم: بۆچی وازم لێناهێنیت تا هەمیشە لە نێو دڵە پڕ خەمەکانو عەقڵە بێزارەکاندا زیندوو بم؟!

خۆشی: چونکە هانا بۆ لای من دەهێنن، دەیانەوێت لە دەستی تۆ ڕزگاریان بکەم!

خەم: بەڵام ناتوانیت لە دەستی من ڕزگاریان بکەیت، چونکە لە دڵەکانیاندا نیشتەجێبووەمو لە عەقڵیاندا گەورەبووم.

خۆشی: بە پشتیوانی خودا دەتوانم، دڵنیابە لە دڵیاندا وەدەرتدەنێمو پیلانو فێڵو تەڵەکەکانت ئاشکرا دەکەم.

خەم: دڵنیام ناتوانیت، چونکە من چەکو تفاقو کەرەسەی زۆرم هەیە، لەوانە بەڵاو ناڕەحەتییەکان، کێشەو گرفتەکان، جودابوونەوەو ماڵاوایی یەکجاری، لە دەستدانی ئەزیزان، نەخۆشیو ناخۆشییەکان... هتد، هەموو ئەمانەش دەبنە هۆی خەمو پەژارەو ئازار، گریانو فرمێسکیش لە ئاگر بەهێزترن!

خۆشی: هەموو ئەو چەکانەی تۆ بێبایەخن، چەکو کەرەسەکانی من لەوانەی تۆ بەهێزترن، کەرەسەکانی من: دڵانێکی پاکو بێگەرد، بەختەوەری، زەردەخەنە، خۆشحاڵی، خەونو هیوا، لێبوردن، تەندروستی، هاوکاری، جوانترینیشیان ئاواتو هیوایە..

خەم: نا، بەڵکو چەکو کەرەسەکانی من بەهێزترن، من هەڵگری ناسنامەی ڕق لێبوونم، هەڵگری ڕقو کینەم، هەڵگری بێ هیواییو بێ ئومێدیم!

خۆشی: بیرت چووه که من خاوەنی شتگەلێکی زۆرترم، خاوەنی بەجێهێنانی سیلەی ڕەحمم، خاوەنی خێرو چاکەم، خاوەنی هاوڕێی باشو بەڕێزم، خاوەنی هیواو ئاواتو خۆشەویستیم، خاوەنی بەخشینو ئاسوودەییم، خاوەنی پێکەوە ژیانو خۆشگوزەرانیم!

خەم: کەواتە ئەی دوژمنی سەرسەختم، من لە چاوەڕوانیدام، تا ڕۆژێك دادێ کە بتوانم شکستت پێبهێنم.

خۆشی: زۆرباشە، چاوەڕێم کە، لە دەروونی نائومێدو بێهیواکاندا، چونکە ئەوێ مەیدانی جەنگەکەمانە، ئەی دوژمنی خەمۆکم!

شەڕ بەردەوامە، تا بزانین کێ لە کۆتاییدا سەردەکەوێت! بەڵێ، بێگومان ئەم شەڕە تاکۆتایی دنیا بەردەوامە، بەڵام دەبێت لە یادمان بێت سەربازەکانی ئەو شەڕە ئێمەین، پێویستە لەسەرمان بزانین کام تیپە هەڵدەبژێرین، ئایا دەبینە ئەندامو لایەنگری خۆشی، یان دۆستو لایەنگری خەم؟ بە کورتی ئێمە ئەنجامەکە دەدەین بە دەستەوە!

هیواداریـن دڵەکانمان لێوان لێوبن لە خۆشیو بەختەوەریو هیواو ئومێد، دووربن لە خەمو پەژارەو فێڵو تەڵەکە.. هەموو ساتێك یادی خۆمانی بهێنینەوە کە خەم نەك هەر چارەسەری هیچ گرفتو ئازارو ناڕەحەتییەك ناکات، بەڵکو بەردەوام خەمو ناڕەحەتی بەدوای خۆیدا دەهێنێو تەندروستیو ژیانمان لێ تاڵ دەکات، ئایندەمان تاریك دەکات، دەمانکاتە سەربازو لایەنگری لەشکری خەم، ئەو کات بەبێ ویستی خۆمان دەبینە لایەنگری خەم!

* گەر هەڵەی دۆستو هاوڕێکانت خەمباری کردوویت، بە لێبوردن دڵت لە خەم پاك بکەرەوە!

* گەر ئازیزێکت ماڵاوایی لێکردوویت، دڵنیابە ڕۆژێك دادێت، بە یەکدی شاد دەبنەوە!

* گەر ماڵو سامانەکەت لەدەستداوە، بیربکەرەوە کاتێك هاتیتە دنیا خاوەنی هیچ نەبوویت، کەواتە تۆ ماڵو سامانت بەدەستهێناوە، دەتوانیت بە پشتیوانی خوداو پاشان بەورەبەرزیت، جارێکی دی بەدەستی بهێنیتەوە، خۆئەگەر هەر لە بنەڕەتدا خاوەنی ماڵو سامان نەبوویت، بیر لە تەندروستیو سەلامەتی ئەندامەکانی جەستەو ئەو ژیرییە جوانە بکەرەوە، کە نایگۆڕیتەوە بە هەموو سامانی دنیا.. خەم بۆ ڕابردوو مەخۆ، چونکە لە دەستی منو تۆدا نەماوەو هەرگیزیش ناگەڕێتەوە، تۆ لە ئەمڕۆدا دەژی، کەواتە لە ئەمڕۆدا کار بکەو هەوڵ بدە بە خۆشی بەسەری ببەیت، پلان بۆ سبەینێت دابنێ، ببەرە هاوڕێو لایەنگری خۆشیو بۆ هەتا هەتایە ڕێگە مەدە جارێکی دیکە ببیتە سەربازی خەم، گەرچی ناخۆشی بێتە ڕێمان لە کۆتاییدا تەواو دەبێتو بەسەر دەچێت، کوردیش لە مێژە وتویەتی تەنگانە بەری کورتە!

# من منداڵی سێیەم بووم

من منداڵی سـێیەم بووم، ئەو کاتەی چاوم بە دنیا هەڵهێنا دایکم تەمەنی ٢٥ ســاڵان بوو، دایکم دەیگوت: ئەو ساتەی لە نەخۆشخانە لە دایکبوویت، برینپێچەکان بێئەوەی ڕێگە بدەن من بتبینم هەڵیانگرتیتو بردیانیت بۆ ژوورێکی دیکە، پاشان ئەو پزیشکەی سەرپەرشتی لە دایکبوونەکەتی دەکرد، هات بۆ لامو پێی گوتم: کە منداڵەکەت واتە من، دەستی چەپی تەواو نییە، لە مەچەکی بەرەو خوار نییەتی، لەبەرئەوە زۆر بە دڵسۆزییەوە کۆمەڵێك ئامۆژگاریی کردمو وتی: تکا دەکەم بەشـێوەیەکی جیاواز لــە منداڵەکانی دیکەت مامەڵەی لەگەڵدا مەکە، نەکەیت بە چاوی ڕقو سووکەوە بۆی بڕوانیت، بەڵکو ئەو زیاتر لە منداڵەکانی ترت پێویستی بــە چاودێریو دڵدانەوەو لاواندنــەوە هەیە، تکایە هەرگیز لەبەرچــاوی کچەکەتدا نارەزایی دەرمەبڕەو هەســتی بریندار مەکە، ئەگەرچی ئێســتا ســاوایەو لەو ڕەفتارانە تێناگات، بەڵام خودا تەمەن بدات، ڕۆژێك دادێت لە هەموو هەستو نەستو جوڵانەوەیەکت تێدەگات..

لەبەرئەوە هیوادارم دایکێکی میهرەبان بیت بۆ ئەم منداڵەتو ببیتە نموونە بۆ هەموو ئەو دایکانــەی منداڵی کەمئەندامیان هەیــە.. دڵنیابە خودا بەم منداڵە تاقیکردوویتەوە، هیوادارم لەو تاقیکردنەوەیەدا زۆر سەرکەوتوو بیت!

ئێستا کە من گەورە بوومو ژیانو بەسەرهاتی خۆم بۆ ئێوەی ئازیز دەگێڕمەوە دەتوانم بڵێم: دایکم زۆر زیاتر لە ئامۆژگارییەکانی پزیشکەکە چاودێری کردوومو گرنگی پێداوم..

ئەو کات من تەمەنم حەوتساڵان بوو، دایکم کە خاوەنی پێنج کچ بوو، بۆ پەیداکردنی بژێــوی ژیانمــانو هاوکاریکردنی باوکم لەو بوارەدا ناچاربوو ڕوو لە کارکردن بکات، ئێمە ئەو دەستە خوشکە کاروباری نێوماڵمان بەڕێوە دەبرد، تا بتوانین هاوکاری دایکمان بکەین، جارێکیان لە چێشتخانەکە هاتمە دەرەوەو زۆر بە توڕەیی هاوارم کرد، من ناتوانم پەتاتە پاك بکەم، چونکە من تەنها یەك دەستم هەیە!

لەو کاتەدا دایکم ســەرقاڵی کارکردن بوو، کاتێك دەنگی توڕەیی منی بیســت، دەستی لە کارەکەی خۆی هەڵگرتو بەرەو لای من هاتو پێکەوە چووینە چێشتخانەکە، پێی وتم: کچی شــیرینم هیچ کات لە دەست کارەکان دەستەوسان مەبە، هەموو توانات بخەرەگەڕ بۆئەوەی بتوانیــت ئەو کارەی دەتەوێت ئەنجامــی بدەیت، هەرگیز نامەوێت جارێکی دی لە زاری تۆ ئەم جۆرە سکاڵایە ببیستم.

پاشان فێری کردم کە چۆن پەتاتە پاك بکەم، وتی: بە دەستی ڕاستت چەقۆکە بگرەو بــە قۆڵی چەپیشــت پەتاتەکە، دایکم بــۆ ئەنجامدانی هەر کارێك شــێوەو ڕێگەیەکی بۆ دادەنــام، هەموو جار دەیگــوت: ئەگەر مرۆڤ تواناکانی بــۆ ئەنجامدانی هەر کارێك چڕ بکاتەوە، ئەوا دەتوانێت هەر کارێك بیەوێت ئەنجامی بدات!

ئەو کات لە پۆلی ســێیەمی ســەرەتایی بــووم، ڕۆژێکیان لە وانەی وەرزشــدا چووینە گۆڕەپانــی قوتابخانە، هەمــوو منداڵەکانم بینی بازیان دەداو بەســەر یارییەکاندا خۆیان هەڵدەواســیو لەم شیش بۆ ئەو شیش بە دەستەکانیان بۆ پێشەوە دەڕۆیشتنو جوڵانەیان دەکردو ڕاهێنانی بەهێزبوونی ماســوولکەکانی دەســتیان ئەنجــام دەدا، کاتێك نۆرەی من هات، ترســامو پاشەکشــەم کرد، نەمتوانی ئــەو یاریانە بکەم کــە هاوپۆلەکانم دەیانکرد، هاوڕێکانیشم دەستیان کرد بە پێکەنین، منیش بە گریانەوە بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

کاتێك شەو داهات دایکم وەکو نەریتی هەموو ڕۆژێکی بە وردی هەواڵی قوتابخانەو وانەکانی دەپرسیم، ئیدی منیش بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، دایکم لە ئامێزی گرتمو دڵنەوایی کردمو وتی: چاوەڕێ بکە بە پشتیوانی خودا هەموو شتێك چارە دەکەین.

بـۆ ڕۆژیـی دواتر دایکم هات بۆ قوتابخانەو چاوەڕێی کـرد تا دەوامی قوتابخانە تەواو بـوو، پاش ئەوەی دەوام تەواو بوو، لەگەڵ دایکمدا ڕۆیشـتینە گۆڕەپانی قوتابخانە بۆ ناو یارییـەکان، پاشـان دایکم ڕێنمایی کردم بـەرەو ناو یارییەکانو وتی: (ئێسـتا هەوڵ بدە تەنها بە دەسـتی ڕاسـتت خۆت هەڵبواسـیت) خۆیشی لە تەنیشـتمەوە وەستابوو، منیش هەوڵمدا خۆم بە یارییەکانەوە هەڵواسم بە بەکارهێنانی دەستی ڕاستمو قۆڵی چەپم، ئیدی لـەو ڕۆژە بەدواوە هەموو ڕۆژێك دایکم لەگەڵمدا دەهـاتو ماوەی یەك کاتژمێر ڕاهێنانی لەسـەر یارییەکانو خۆ هەڵواسـین پێ دەکردم، تا گەیشـتمە ئەو ئاستەی زۆر بە ساناییو سەرکەوتوویی تەواوی یارییەکان ئەنجام بدەم..

هەرگیـز ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچێت، جارێکی دیکە هەر لە وانەی وەرزشـدا مامۆسـتاکەمان بردینیـەوە بـۆ گۆڕەپانەکـەو قوتابیان ڕیزیان گرتبـوو، تا هەر یەکێك نـۆرەی بگاتێو یاری خۆهەڵواسینو بەرزبوونەوە بکات، کاتێك نۆرەی من هات، قوتابیان چاوەڕێیان دەکرد پاشەکشە بکـەمو نەتوانـم یارییەکە ئەنجام بدەم، بەڵام کاتێك بینیان زۆر بە سـەرکەوتووییو بە تەنها دەسـتێك هەموو یارییەکانم ئەنجامدا، چاویان ئەبڵەق ببوو، بە تەواوی سـەریان سـوڕمابوو! منیش بەوپەڕی دڵخۆشـییەوە بە تیلەیەکی چاو سـەیرێکی ئەو کەسـانەم کرد، کە لە جاری پێشوودا گاڵتەیان پێ کردبووم!

دایـــــکـم بەردەوام لە هەموو هەنگاوەکانمدا لەگەڵمدا بوو، ئەو بۆ ئەنجامدانی هەر کارێـك بیرۆکەیەکـی نوێی فێر دەکردم تا شـتێك نەبێت لەم ژیانەدا مـن بڵێم ناتوانم ئەنجامی بدەم، هەرگیز نەیدەهێشت بە هۆی نەبوونی دەستی چەپمەوە هەست بە کەمی بکەم، تەنانەت زۆرجار من تووڕە دەبوومو لە دڵی خۆمدا دەمگوت دایکم نازانێت من چەند دووچـاری دەردەسـەریو ناڕەحەتی دەبم، ئەو گرنگی نادات بـەو ناڕەحەتییە زۆرەی کە دووچارم دەبێت لە کاتی ئەنجامدانی ئەو کارانەدا!

بـــەڵام من هەر كاتێـــك دووچاری ناڕەحەتییەك ببوومایەتـــەوە، یان گرفتێك ڕووی تێ بكردمایە، دەڕۆیشـــتمە ژوورەكەی خۆم تا بە تەنها بەو تێر تێر بۆ حاڵو گوزەرانی خۆم بگریم، بەڵام دەســـتبەجێ دایكم دەهات بۆلامو زۆر بەســـۆزو میهرەبانییەوە پرســـیاری لێ دەكردم: كچە شـــیرینەكەم ئەوە چیتە؟ كاتێـــك هۆكاری گریانەكەم پێ دەگوت، كەمێك بە چاوە جوانەكانی سەیری دەكردمو پاشان دەیگوت: هیچ نییە خۆم چارەسەری دەكەم!

زۆرجار كاتێك بە قورگی پڕ لە گریانو چاوی پڕ لە ئەسرینەوە قسەم بۆ دەكرد، سەیرم دەكرد دایكیشم هۆن هۆن فرمێسك بە ڕووخساریدا دێتەخوارەوە، لە ڕاستیدا ئێستا دەزانم دایكم چەند لەگەڵ مندا ماندووبووەو ناڕەحەتی چەشتووە، تەنانەت زۆرجار نەیدەهێشت مـــن بە گریانو خەمەكانی بزانم، نەبادا من دڵتەنگو نیگەران بم! لە ماوەی ڕۆژگارەكانی ژیانمدا، دایكم گەورەترینو باشـــترین هاوڕێو هاودەمم بوو، هەر كات دەمویســـت كەمێك لـــە خـــەمو ناڕەحەتییەكانم بە فرمێســـكی چاوەكانم دەربڕم، دڵنەوایـــی دەكردمو ئارامی دەكردمەوەو نەیدەهێشت بە تەنها بم، كاتێكیش گەورە بوومو خوێندنم تەواو كردو بوومە فەرمانبەر، پاشـــان چوومە نێو ژیانی هاوســـەرییەوە، ئێســـتا ژیانێكی زۆر ئاسوودە لەگەڵ هاوسەرە ئازیزەكەمدا دەگوزەرێنینو خاوەنی چوار منداڵم!

بـــە داخـــەوە دایەگیانم چەند ســـاڵێك لەمەوبەر بە هۆی تووشـــبوونی بە نەخۆشـــی شـــێرپەنجەوە بـــۆ دواجار ماڵاوایـــی لێكردین، منیش هەرگیز ئەو دایكـــە بەڕێزەم لە یاد ناكـــەم، مامۆســـتام بوو، هاوڕێم بـــوو، دایكێكی دڵســـۆزو میهرەبانم بـــوو، تەنها ئەو بوو فێری كردم، كە چۆن وەڵامی پرســـیارە گرنگـــەكان بدەمەوە، ئەو كاتەی من منداڵ بووم، بەردەوام لە خۆمم دەپرسی بۆچی دەبێت من بەو شێوەیە خۆم ماندوو بكەم؟ بەڵام ئێستا وەڵامەكەی دەزانم، بەڕاســـتی ناڕەحەتیو نەهامەتیو ناخۆشییەكانی ژیان مرۆڤ دروست دەكات، من لە دایكمەوە فێری ئازایەتیو ورەبەرزیو هەوڵدان بووم! بەو هیوایەی هەموو دایكێك بتوانێت بەو شـــێوەیە منداڵەكانی پێ بگەیەنێت، بە تایبەت ئەگەر خوانەخـــستە خاوەنی منداڵێكی كەمئەندام بوو.

# سیفات گەلێك لە درەختدایە.. خۆزگە لە مرۆڤیشدا هەبووایە

بە وردی سەرنجی درەخت بدە، لەناو كرۆكی درەختدا چەندین جۆر بوونەوەر هەیە، هەموو ئەو زیندەوەرو گیانلەبەرانەی پەنای بۆ دەبەن، پەنایان دەدات.. باڵندەكان لەسەر چڵو لقەكانی ئارام دەگرنو دەحەسێنەوە، دەیكەنە هێلانەو جێگەی حەوانەوەیان..

درەختەكان ناخیان دەكەنە جێگەو لانەی زیندەوەران.. كەواتە با ئێمەش وەكو درەخت بین، داواو تكای هیچ كەس ڕەت نەكەینەوە، ببینە دایەنگەی هەموو ئەو كەسانەی پێویستیان پێمانە.. وەكو درەخت بەخشندەبین.. كێ لە ئێمە نەڕۆیشتووە بۆ لای درەختەكان، بۆ ئەوەی لە بەروبوومەكەی بخۆین، ئایا هیچ كات درەختەكان دەبنە ڕێگر لە چنینی بەربوومەكانیان؟

كەواتە با ئێمەش ڕێگر نەبین، لەو برسیانەی ڕوومان تێدەكەن، لەو تینوانەی دێنە بەر دەرگامان، تەنانەت ئەگەر گیاندارێك، یان باڵدارێكی تینووە..

ئافرەتێك چووە لای خاتوو عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت)، دوو منداڵی لەگەڵدا بوو، داوای خواردنیان كرد، لەو كاتەدا هیچ شتێك لە ماڵی پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت) نەبوو، جگە لە چەند دەنكە خورمایەك، خاتوو عائیشە، بێئەوەی بیر لە ژەمی خواردنی

خۆیان بکاتەوە، هەڵسا خورماکەی بۆ هێنانو پێی بەخشین، ئافرەتەکە خورماکەی کردە سێ بەش، بەشێك بۆ خۆیو هەر یەك لە منداڵەکانیشی بەشێکی پێدان، دیاربوو منداڵەکان زۆر برسیان بوو، بۆیە پێش ئەوەی دایکەکە دەست بکات بە خواردنی بەشە خورماکەی خۆی، منداڵەکان بەخێرایی دەستیان کرد بە خواردنی بەشە خورماکەیان، لە چاوترێکانێکدا بەشە خورماکەی خۆیان خوارد، دایکەکە کە هێشتا دەستی بۆ بەشەکەی خۆی نەبردبوو، تەماشای کرد منداڵەکانی سەیری دەستی دایکیان دەکەن، ئەویش لە پێناوی جگەر گۆشەکانی دڵی برِوای نەدا خۆی بیخوات، هەربۆیە بەشەکەی خۆی کردە دوو بەشو هەر یەکی بەشێکی پێدان.. ئەم دیمەنە زۆر کاری لە خاتوو عائیشە کرد..

کاتێك پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت) گەڕایەوە ماڵ، خاتوو عائیشە ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.. پێشەوا (سەلامی خوای لێبێت)، فەرمووی: (ئەو ئافرەتە بەهەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد)... (خۆتان بپارێزن لە ئاگر، ئەگەر بە دەنکە خورمایەکیش بێت)..

- گرنگی بە دەوروبەرت بدەو هەمیشە چاکەیان لەگەڵدا بکە، تەنانەت لەگەڵ ئاژەڵو زیندەوەرانیش..

- پێشەوا (سەلامی خوای لێبێت) هەواڵمان پێدەدات، کە پیاوێك دەچێتە بەهەشتەوە، تەنها بە هۆی ئەوەی بە دەم سەگێکەوە چوو، ئاوی پێداو لە تینوێتی ڕزگاری کرد..

- لە هەمان کاتدا هەواڵمان دەداتێ، کە کەسێك دەچێتە ئاگرەوە، بە هۆی بەندکردنی پشیلەیەکەوە تا ئەو کاتەی گیان لە دەستدەدات.

- هیچ چاکەیەك بە کەم مەزانە، هاوکات هیچ خراپەیەکیش بە کەم مەزانە..

- سۆزو بەزەییت با وێنەی درەخت بێت.. درەخت چڵو لقەکانی، تاك تاکە، بۆئەوەی ببنە سێبەر بۆ دەوروبەریان، تا لە گەرمای خۆر بیانپارێزێ، تا لە گەرمای بەتینی هاویندا ببنە جێگەی حەوانەوەی ڕێبوارانی بیابان..

لە ناواخنیاندا دەبنە لانەی ئەو کەسانەی لەبەر سەرمای زستان پەنایان بۆ دەبەن..

**قوربانیدان..** بنوارە درەخت چۆن قوربانی بە خۆی دەدات؟

ئەو کاتانەی مرۆڤ سەرمای زستان تەنگی پێهەڵدەچنی، تاکە هۆکار بۆ خۆ گەرمکردنەوەو خۆپاراستن لە سەرما، تەنها لای درەختەکان بوو، درەختەکان دارو ڕووناکییان پێدەبەخشین، تا گەرممان بکەنەوە.. کەواتە ئێمەی مرۆڤیش، با گەرمیو

ڕووناکی بین بۆ دەوروبەرمان، یا مەنزلگای هیوا بین بۆ ئەو کەسانەی هیوا لە دڵەکانیاندا کوژاوەتەوە، ڕووناکی بین بۆ ئەو کەسانەی دڵەکانیان تاریکی دایپۆشیوە..

بیر بکەرەوە لە سیفاتی لێبوردەیی درەختەکان..

هەرچەندە ڕەشـــەباو زریانەکان بەهێزتربن، درەختەکان لقو چڵەکانیان والآدەکەن، تا لەوێوە گوزەر بکەن، گوێ ناداتێ ئازاری دەگات، لقێکی دەشکێتەوە، یان نا..

کەواتە با ئێمەش لێبوردە بین، باڵەکانمان بکەینەوە، دڵەکانمان والآبکەین، بۆ خراپەی ئەو کەسانەی خراپەمان بەرامبەر دەکەن، لێگەڕێ با تێپەڕێ، ئاوڕی بۆ مەدەرەوە..

سەیری هیوای درەختەکان بکە..

لە ساتەکانی ســاردو سەرماو ڕەهێڵەی زستاندا، درەختەکان گەڵاکانیان دەوەرنو لێیان جــودا دەبنەوە، ئێمە وا هەســتدە کەین درەختەکان مــردوون.. بەڵام پاش کۆتایی هاتنی زســتان، بە گەڵای جوانترو گەشــتر خۆیان دەڕازێننەوە.. کەواتە تۆش گەشــبینبە، ئەگەر شتێکت لە دەستدا، یان شتێکت لێ ونبوو، دڵنیابە ڕۆژێك دادێت دەتوانی بە دەستی بهێنیتەوە.. سوننەتی ژیان وایە: (دوای هەموو ناخۆشییەك خۆشییە)!

درەخت لە هەموو شوێنێك بوونی هەیە..

لە زۆربەی زۆری ئەم ســەرزەوییەدا درەخت بوونی هەیە.. درەختەکان لەگەڵ هەموو شوێنو کاتێکدا ڕادێنو خۆیان دەگونجێنن..

کەواتە تۆش کەســێکی کۆمەڵایەتیبە، لەگەڵ هەموو ئەو کەســانەی دەیانناســیت، یان نایان ناســیت، با لە هەموو جێگەو کاتێکدا بوونت هەبێت، چونکە ئامادەبوونت واتایەکی جوان دەبەخشێت، هەوڵبدە لەگەڵ کەسانی دەوروبەرتدا خۆت بگونجێنیت..

سەربڵندی..

هیچ زیندەوەرێکم نەبینیوە، پاش مردنی، بە ڕاوەستاویی‌و بڵندی بمێنێتەوە، جگە لە درەخــت.. ئەوە مانای ئەوە نییە، خۆمان لاگەورە بێت، ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە بگەینە ئاستی خۆبەگەورەزانین بەرامبەر ئەو کەسانەی لە ڕووی ماددی‌و زانستی‌و کۆمەڵایەتییەوە لە خوار ئێمەوەن.. بەڵکو ئەوە مانای ئەوەیە کە ئێمە لە دوای مردنمان ســیفەتە جوانو نایابەکانمان بمێنێتەوە، مانای ئەوەیە بە زیندوویی کارێك بکەین، کە لە دوای مردنیشمان سوود بە کۆمەڵگە بگەیەنێت.. چاکەیەك بکەین کە بۆ هەمیشە بمێنێتەوە..

# وەکو مانگ بە، نەك وەکو دووکەڵ!

**مانگ.. خەڵکی سەریان بەرزدەکەنەوە، بۆئەوەی بیبینن!**

**دووکەڵ.. بەرزدەبێتەوە بۆئەوەی خەڵکی بیبینێت.**

**خەڵکانێـك هەن، سـالانێکی زۆرە لە ژیاندان، بـە چەندەها بارودۆخی خۆشـگوزەرانیو بەختەوەریدا تێپەڕیون، بەڵام سەرەنجامی ژیانیان، بە سفر کۆتایی دێت.**

**کەسانێکی دیکە هەن، ژیانیان کورتە، هەروەکو ئەوان بە چەندین بارودۆخی خۆشگوزەرانیدا تێپەڕیـون، بەڵام سـەرەنجامی ژیانیـان ژمارەیەکی گەورە لە نێـو ژمارەکانی پاڵەوانان‌دا بەدەستدەهێنن.**

**یەکەمیان لە پەراوێزی ژیاندا دەژی، گرنگی بە هیچ کەس نادات جگە لە خۆی، هەرگیز**

بیر لەبەرژەوەندی خەڵکی ناکاتەوە، بەرژەوەندی گشتی لەلا مەبەست نییە، هەمیشە هەوڵ بۆ کۆکردنەوەی سەروەتو سامان دەدات، بەبێئەوەی نەخۆیو نەدەوروبەری سوودی لێببینن، هەرگیز هەوڵی نەداوە گریانێك بگۆڕێت بۆ خەندە، خەمێك بگۆڕێت بۆ خۆشی، کەسێکی خودپەسەندو بێسوودو چاوچنۆکە.

ئەمجۆرە کەسانە دەمرن، بێئەوەی کەس هەست بە مردنیان بکات، چونکە مردنی ئەوان هیچ شتێك لە ژیان ناگۆڕێت، بە نەبوونیان هیچ لە گەردوون کەم نابێتەوە، بە ماڵاواییان زیان بە بەرژەوەندی هیچ کەس ناگات، لە دنیا دەردەچن، بێئەوەی کەس ئاخێکیان بۆ هەڵکێشێت.

بەڵام جۆری دووەم.. بە هەموو واتاکانی ژیان لە دنیادا دەژین، هەمیشە بەرژەوەندی خەڵکی دەخەنە پێش بەرژەوەندی خۆیانەوە، بەردەوام چاکە لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن، کەسانێکی چالاكو بەسوودن بۆ کۆمەڵگە، لە خەمو خۆشی دەوروبەرەکەیاندا بەشدارن.

ئەمجۆرە مرۆڤانە هەر کات ماڵاوایی لە ژیان بکەن، بە مردنیان ئاسمان دێتە لەرزە، بە جیابوونەوەو ماڵاوایی یەکجارەکیان زەوی خەمبار دەبێت، خەڵکی بە مردنیان نیگەرانو دڵتەنگو بێتاقەت دەبن، چونکە ماڵاوایی ئەم کەسانە هەر ماڵاوایی مرۆڤێك نییە، بەڵکو ماڵاوایی سەدان چاکەیە..

دەگێڕنەوە ئەو شەوەی زەینولعابدین کۆچی دوایی کردو بۆ دواجار ماڵاوایی لە ژیان کرد، یەکێك لە هەژارەکان چاوەڕوان بوو ئەو خواردنەی بۆ بهێنن کە هەموو شەوێك کەسێکی نەناسراو تەقەی لە دەرگای ماڵیان دەداو خوانەکەیانی ئاوەدان دەکردەوە، بەڵام بەداخەوە کات درەنگ بوو، هیچ کەس لە دەرگای نەدا، هەربۆیە دەرگاکەی کردەوە تا هەواڵێك بزانێت، سەیری کرد دراوسێکەشیان بە هەمان شێوە هاتۆتە دەرەوەو لەبەردەرگا ڕاوەستاوە، پرسی بۆچی بەم درەنگانەی شەو هاتوویتە دەرەوە، وەڵامی دایەوەو وتی: چاوەڕوانی پیاو باشەکەم، کە هەموو شەوێك خواردنی بۆ دەهێناین، بەڵام ئەمشەو دیار نییە، ئەویش گوتی کە هەمان هۆکار منیشی هێناوەتەدەر.

ئەو شەوە هەر دەرگابوو دەکرایەوەو چاوەڕوانی ئەو خێرخوازەبوون کە هەموو شەوێك خوانی ماڵەکانیانی دەڕازاندەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو شەوە هیچ کەس نەبوو خوانەکانیان بڕازێنێتەوە، منداڵەکانیان بهێنێتە خەندەو پێکەنین، خۆشیو شادی لە نێوانیاندا دروست

بکات، سـکە برسـییەکان تێر بکات، ڕووخسارە خەماوییەکان خۆشـحاڵو ئاسوودە بکات..
هەمووان ئەو شەوە بە برسێتی سەریان نایەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر هەواڵ بڵاوبووەوە کە زەینولعابدین گەڕاوەتەوە بۆ ڕەحمەتی خوداو بۆ دواجار ماڵاوایی لە ژیان کردووە!

ئەو کات هەژارەکان زانییان ئەو کەسـەی هەموو شەوێك سەردانی ماڵەکانیانی دەکردو خوانەکانی بۆ دەڕازاندنەوە، ئەوە زەینولعابدین بووە، کە تا ئەو ساتە  جگە لە خودا هیچ کەس نەیدەزانی کێیە!

هەموو شـەوێك هەژارەکانی بەسـەر کردبووەوەو خواردنی بۆ بردبوون.. کە ژمارەیان نزیکەی ١٠٠ ماڵ بوو.

لەبەرئەوە ژمارەیەکی گەورەی وەرگرت لە مێژووی مرۆڤایەتیداو لە تۆماری پاڵەوانەکان ناوی تۆمار کرا.

ئەی دەوڵەمەندەکانی ئێمە، دەبێت چەند کەسـیان دیاری کردبێت شـەوانە بەسەریان بکەنەوە؟!

دەزانم دەڵێن: دەوڵەمەندەکانی ئێمە بە دوو پرسگە ناگەیتە لایان!!

خۆئەگەر هەندێکیان چەند ماڵێکیان دیاری کردبێت، مانگانە هاوکارییان بکەن، هێشتا جیاوازی زۆرە لەگەڵ زەینولعابدیندا، ئەو بە دەسـتی خۆی، خواردنی دەبەخشـی، بەڵام ئێوە کارمەندەکانتان پارمەتییەکانتان دەگەیەنێت!

زۆرێك لە خەڵکی ئەم سەردەمە دەوڵەمەندو خاوەن سەروەتو سامانن، دەژینو دەمرن، بەڵام هیچ کەس نە بەبوونیانو نە بەمردنیان نازانێت.

دەزانن بۆچی؟ چونکە ئەوانە سفرن لە لای چەپی ژمارەوە!!

کەواتە با هەموومان هەوڵ بدەین، کەسێکی سوودبەخشو چالاك بین، هەمیشە هاوکارو هاوخەمی دەوروبەرمان بین، هەموو کات بەرژەوەندی گشتی بخەینە پێش بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆمانەوەو هەست بە بەرپرسیارێتی بکەین، هەتا ئەم هەستە گەورە ببێت لەلامان، نرخی مرۆڤو مرۆڤایەتی لەلامان گەورە دەبێت.

هەمیشە هەوڵ بدە لە ژیاندا ژمارەیەکی گەورەبیت، ئاگاداربە نەبیتە ژمارە سفر!

# تۆپی ئاڵتونی!

بازرگانێکی دەوڵەمەند زۆر سەرسامی بارودۆخو خۆشحاڵیو بەختەوەری دراوسێ هەژارەکەیان دەبێت، ئەوان لەگەڵ ئەوەی زۆر هەژارو نەدارو دەستکورتن، بەڵام زۆر خۆشحاڵو ئاسوودەو بەختەوەرن، هەرچەندە ئەم دراوسێ دەوڵەمەندەیان سەرنجیان دەدات ئەوان کاتەکانیان بەوپەڕی شادومانیو خۆشحاڵییەوە بەسەردەبەن، دەبینێت لەوپەڕی شادیو تەباییو بەختەوەریدان، بەڵام ئەمان ئەگەرچی خاوەنی سەروەتێکی بێ شومارو خانوو ئۆتۆمبێلی مۆدێرنن، بەختەوەرو ئاسوودە نین، کاتەکانیان لە نائارامیو خەمو پەژارەدا بەسەردەبەن، لەبەرئەوە دەوڵەمەندەکە ناچار بوو بۆ زانینی ئەو نهێنییە ڕاستەوخۆ پرسیار لە دراوسێ هەژارەکەیان بکاتو بڵێت: ئایا دەتوانم بزانم هۆکاری ئەو هەموو بەختەوەرییو شادومانییە چییە کە لە ئێوەدا بەدی دەکرێت، لە کاتێکدا نەخاوەنی پارەو سامانێکی ئەو تۆنو نە خانوویەکی خۆشتان هەیەو نە ئۆتۆمبێلی مۆدێرن!

دراوسێ هەژارەکەیان بە خەندەوە وەڵامی دایەوە کە ئەوان خاوەنی تۆپی ئاڵتونین، بە درێژایی شەو یاری بەو تۆپە ئاڵتوونییە دەکەنو لەوپەڕی بەختەوەریو شادومانیدا لەگەڵ

ئەندامانی خێزانەکەیدا ژیان دەگوزەرێنین!

زۆر بەپەلــە دەوڵەمەندەکە ڕۆیشــت بۆ لای زەرەنگەرو بــە تۆپێکی ئاڵتونی جوانەوە گەڕایەوە..

ئەو شــەوە لەگەڵ خێزانەکەیدا دەســتیان کرد بــە یاریکردن بە تۆپــە ئاڵتونییەکە، بۆئەوەی وەکو دراوســێکەیان هەســت بە بەختەوەری بکەن.. بەڵام ســەرەڕای ئەوەی ئەو شــەوە تا خەو بردنییەوە یارییان بە تۆپی ئاڵتونی کرد، لەگەڵ ئەوەشــدا بەداخەوە هیچ هەســتییان بە بەختەوەری نەکرد، دووبارە وەکو شــەوانی دی بە خەمبارییەوە خەویان لێکەوت..

بۆ بەیانی دووبارە دەوڵەمەندەکە پرســیاری لە دراوسێکەیان کردەوە کە هۆکاری ئەوە چییــە، ئەوان لەگەڵ ئەوەشــدا یارییان بە تۆپی ئاڵتونی کرد، بــەڵام هەر خەمباربوونو دڵخۆش نەبوون؟

دراوسێ هەژارەکەیان بەوپەڕی متمانە بەخۆبوونەوە وەڵامی دایەوە: دراوسێ ئەزیزەکەم، من مەبەســتم لە تۆپی ئاڵتونی منداڵەکانم بوو، ئەوان جوانترین نیعمەتی ئەم دنیایەن بۆ من، کاتێك بەوپەڕی لەشساغیو تەندروستییەوە لەگەڵ خێزانو منداڵەکانمدا کاتەکانم بەســەردەبەمو پێکەوەو لە کەشــێکی پڕ لە تەباییو خۆشەویســتیدا یاریو گاڵتەو گەپ دەکەیــن، بەختەوەریو خۆشــحاڵی دەبێتــە میوانی ماڵمانو لێمان جــودا نابێتەوە، نەك لەگەڵ تۆپێکی ئاڵتونی بێ هەستو بێ گیان..

خۆشەویســتان چیرۆك گەلێکی زۆر هەن فێرمان دەکەن کە بەختەوەری لە سەروەتو سامانو کۆشكو تەلارو ئۆتۆمبێلی مۆدێل بەرزدا نییە، خۆ ئەگەر بەختەوەری لەو شتانەدا بووایە، ئەوا دەستکەوتنی بۆ زۆرێکمان ئاستەمو دژوار دەبوو.. بەڵام بەختەوەری لە ناخی مرۆڤەکاندایە، لە تەندروستیو لەشساغیدایە، لە بوونی خێزانو منداڵی ژیرو ئاکار جوانو ڕەوشــتبەرزدایە.. لەسەرو هەموو ئەمانەشدا بەختەوەری لە ناسینی خودای بە دەسەڵاتو بەدیهێنــەری ئەم گەردوونەدایە.. کاتێك مرۆڤ بــووە خاوەنی باوەڕێکی پتەوو دامەزراو، ئــەوا هیچ هێزێك ناتوانێــت بەختەوەری لێ زەوت بکات.. کەواتە مرۆڤەکان بە ئاســانی دەتوانن بەختەوەری بەدەســتبهێنن، لەبەرئەوە دەڵێین: بۆ بەدەســتهێنانی بەختەوەریو ئاسوودەیی دوور مەڕۆ، چونکە لە خۆتەوە.. نزیکە.

# جیاوازی نێوان هاوڕێی ئاسایی و هاوڕێی ڕاستەقینە!

**هاوڕێی ئاسایی:** بە درێژایی تەمەنت نابینێت فرمێسکێکت بۆ هەڵوەرێنێ، نە بەخەمەکانت خەمبارە، نە بەشادییەکانت خۆشحاڵە.

هاوڕێی ڕاستەقینە: هەر کات سکاڵای خۆتی لابکەیت، ئەسرین بە چاوەکانیدا دێتە خوار، یان لانی کەم لە دڵەوە بۆ حاڵی تۆ دەگری.

**هاوڕێی ئاسایی:** تەنها ناوی خۆت دەزانێت، تەنانەت ناوی باوکو دایکیشت نازانێت.

هاوڕێی ڕاستەقینە: ژمارە تەلەفۆنی باوکتو دایکتی لە مۆبایلەکەیدا تۆمارکردووە.

**هاوڕێی ئاسایی:** تەنها بە قسەکردن بە شداری کێشەو گرفتەکانت دەکات..

هاوڕێی ڕاستەقینە: هەمیشە هەوڵدەدات بە کردەوە یارمەتیت بدات، بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانتو ڕەواندنەوەی خەمو نارەحەتییەکانت.

**هاوڕێی ئاسایی:** سەبارەت بە ژیانی تایبەتیت پرسیاری زۆرت لێدەکاتو وەڵامەکانیش ناپارێزێت.

هاوڕێی ڕاستەقینە: هەمیشە هەوڵی پاراستنی مێژووی ژیانت دەداتو نهێنییەکانت دەپارێزێت.

**هاوڕێی ئاسایی:** لەو باوەڕەدایە هاوڕێیەتی نێوانتان تاسەر نییەو ئەگەر ڕۆژێك کێشەو ناکۆکییەك کەوتە نێوانتانەوە، هاوڕێیەتیتان کۆتایی دێت.



هاوڕێی ڕاستەقینە: ئەگەرچی کێشەیەك، یان ناکۆکییەك لە نێوانتاندا ڕوویدات، ئارامدەگرێتو بەرگەدەگرێت، چونکە ئەو دڵنیایە کە هاوڕێیەتیتان بۆ ڕۆژێكو دووان نییە، بەڵکو بەردەوامەو بۆ هەمیشەیە.

هاوڕێی ئاسایی: هەر جارێك سەردانت دەکات، وەکو میوانێك هەڵسوکەوت دەکات کە یەکەمجارە هاتۆتەماڵتان.

هاوڕێی ڕاستەقینە: وەکو خاوەن ماڵ هەڵسوکەوت دەکات، هاوکاریت دەکات بۆ خزمەتکردنی میوانەکانت.

هاوڕێی ئاسایی: هەمیشە چاوەڕێ دەکات کە خزمەتی بکەیت..

هاوڕێی ڕاستەقینە: هەمیشە حەز دەکات کە خزمەتت پێشکەش بکات.

هاوڕێی ئاسایی: هەمیشە لەبەرچاوی کەسانی دی ڕەخنەت لێدەگرێت.

هاوڕێی ڕاستەقینە: هەمیشە سەرنجو تێبینییەکانیت بە تەنها پێدەڵێت.

هاوڕێی ئاسایی: لە لای خۆت وەسفو ستایشت دەکاتو باس لە چاکەکانت دەکات، لە پاشملە باس لە کەمو کورتیو نەنگییەکانت دەکات.

هاوڕێی ڕاستەقینە: وەکو ئاوێنە وایە، یەك ڕووی هەیە، لە بەرەوڕوو پاشملە، باس لە چاکەو هەڵوێستە ناوازەکانت دەکات.

هاوڕێی ئاسایی: ئەگەر ڕۆژێك خراپەیەکت لەگەڵدا کرد، چاکەکانی لەوەو پێشت دەسڕێتەوەو تەنها ئەو خراپەیەت بۆ حساب دەکات.

هاوڕێی ڕاستەقینە: ئەگەر خراپەیەکت لەگەڵدا کرد، بیر لە چاکەکانت دەکاتەوە.. هەرگیز چاوەڕێ ناکات داوای لێبوردنی لێ بکەیت، هەمیشە هەوڵدەدات دەستپێشخەری بکات.

هاوڕێی ئاسایی: بە هەر هۆکارێکی لاوەکی، خۆی نیگەرانو زیز دەکات.

هاوڕێی ڕاستەقینە: جاروبار نیگەران دەبێت، بەڵام هەرگیز زیز نابێت.

هاوڕێی ئاسایی: لە نهێنییەکانت دەگەڕێ، تا بڵاویان بکاتەوە.

هاوڕێی ڕاستەقینە: لە هەموو بارودۆخێکدا پارێزگاری لە نهێنییەکانت دەکاتو هەرگیز نایاندرکێنێت.

**کەواتە پێم بڵێ هاوڕێکەت کێیە؟ تا پێت بڵێم تۆ کێی!**

# پەیامێك بۆ ئەو مرۆڤانەی پێخەف بووەتە هاوڕێی هەمیشەییان

لە هەموو گرفتو ناخۆشیو نەخۆشییەکدا کە لە ژیاندا دووچاری دەبین، ڕووبەڕووی لایەکی ڕووناك دەبینەوە، ئەو کەسەی بە دڵسۆزی تێدەکۆشێو هەوڵدەدات هەرگیز ڕێگە هەڵە ناکات، بەڵام زۆربەی خەڵکی دەناڵێنن بە دەست ناخۆشیو بەربەستەکانی ژیانەوە، ئەم بەربەستو ناخۆشییانەش هۆکاری ڕێگریو دەستەوسانی مرۆڤن لە ڕۆیشتن بۆ ڕێگای هێنانەدی هیواو ئاواتو داهێنانەکانی.

بۆ هەموو ئەو کەسانەی بانگەشە دەکەن کە نەخۆشی ڕێگرە لەبەردەم هێنانەدی هیواو ئاواتەکان، کۆتو زنجیری داهێنانەکان دەکات، ئەم نموونە ڕۆشنو هیوابەخشانەی دەکەینە دیاری، بۆ ئەو کەسانەی دەگەڕێن بۆ لایەنی ڕووناك لە کاتی تووشهاتنیان بە ناڕەحەتیو نەخۆشی، بەو هیوایەی پەندیان لێوەربگرین:

**یەکەم: محەممەد ئەسعەد یەساری!**

ئایا پێشتر ئەم ناوەت بیستووە؟! ئەم کەسە بلیمەتێکی خۆشنووسی بە ناوبانگ بوو، لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانیدا؟ ئەگەر نایناسیت هەموو هەستەکانت کۆبکەرەوەو وەرە لەگەڵماندا بۆ وەرگرتنی پەند لە ژیاننانمەی ئەم بلیمەتە!

محەممەد ئەسعەد لە وڵاتی تورکیا لە شاری ئەستەنبوڵ لە دایکبووە، هەر لە کاتی لە دایکبوونیدا لای ڕاستی شەلەل لێی دابوو، تەندروستی لای چەپیشی زۆر باش نەبوو، جەستەی زۆر لاواز بوو، کێشی زۆر کەم بوو، نەیدەتوانی لە شوێنی خۆی هەڵسێت.

دوای گەورەبوونی تەمەنی، بڕیاریدا هەر چۆنێك بێت کارێك بدۆزێتەوە کە لەگەڵ سروشتی جەستەیدا بگونجێت، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆیشت بۆ لای مامۆستایەکی ناسراوو بەناوبانگ بە ناوی (ولی الدین أفندی) مامۆستای هونەری خۆشنووسی، بۆئەوەی فێری هونەری خۆشنووسی بکات، کاتێك مامۆستا (ئەفەندی) سەیری سروشتی جەستەی کرد، پێی وابوو محەممەد هەرگیز ناتوانێت ئەو هونەرە فێر بێت، هیچ ئاواتێکی لە هیواکانیدا بەدی نەدەکرد، لەبەرئەوە داواکەی ڕەتکردەوە، محەممەد هەر چەندە زۆر نیگەران بوو، بەڵام نائومێد نەبوو، لە بری ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ماڵو بڵێ هەوڵمدا، بەڵام کەس هاوکاری نەکردم، وەکو کەسێکی ورەبەرزو بە توانا بۆ هێنانەدی ئاواتەکەی ڕووی کردە مامۆستایەکی دیکەو هەمان داوای پێشکەشکرد، ئەویش کاتێك سەرنجی دا، هەستیکرد کە پێویستە هاوکاری محەممەد بکاتو هەرچی لە توانایدایە پێشکەشی بکات، محەممەد زۆر کۆڵنەدەرانە هەوڵی فێربوونی دەدا، خوێندکارەکانی هاوڕێی زۆر سەرسامبوون بە توانا بەرزەکانی، تەنها دوای ماوەیەکی کەم! دەزانن چی ڕوویدا؟!

توانی بڕوانامەی خۆشنووسی بەدەستبهێنێت! بۆ ئەم مەبەستە واتە بە بۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی خۆشنووسی، هەستا بە گێڕانی ئاهەنگێکی گەورە، هاوکات لە ڕیزی ئامادەبوواندا مامۆستا (ولی الدین أفندی) ئامادەی ئاهەنگەکە بوو، کاتێك سەیری نووسراوەکانی محەممەدی کرد، وتی: ئەگەر من مامۆستای بوومایە، ئێستا ئەم شەرەفە بە من دەبەخشرا، بەڵام بەداخەوە لە دەستم چوو!!

(ولی الدین أفندی) لە بۆنەیەکی تردا وتی: خوای گەورە ئەم پیاوەی نارد تا لووتبەرزی ئێمە بشکێنێت!

محەممەد ئەو لاوەی لایەکی شەلەل لێیدا بوو، بە دەستی چەپی دەینووسی، ئەو کەسەی کاتێك بیانگواستایەتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە سەبەتەیەکدا هەڵیان دەگرت، ئێستا بووەتە مامۆستای خۆشنووسی لە کۆشکی عوسمانیدا، بووەتە خاوەنی پێنووسی خەلیفە، نووسەری تایبەتی کتێبەکانی خەلیفەیە، هەروەها ڕێگەیەکی نوێی کردەوە لە خەتی تەعلیقی فارسی.

دووەم: (جون دومنیك بوبی)!

ئایا پێشتر ئەم ناوەت بیستووە؟ئەم پیاوە شتێکی کردووە، گومان نابەم لە پێش ئەودا هیچ کەس لە مێژوودا کاری وەهای کردبێت!

تەنها ئەوەی لەسەر تۆی خوێنەر پێویستە، لە دێڕەکاندا لەگەڵمان بمێنەرەوە، بۆئەوەی بە داهێنانە سەرسوڕهێنەرەکەی ئاشنا بیت!

(جون دومنیك بوبی) خێزاندارەو خاوەنی منداڵە، لە وڵاتی فەرەنسـا لە شاری پاریس دەژی، سەرنووسـەری گۆڤـاری (إیل) بوو، لە زسـتانی سـاڵی (١٩٩٥)دا لـەو کاتەی بەفر شەقامەکانی یەك پارچە سپی کردبوو، ئۆتۆمبێلە تایبەتییەکەی خۆی لێدەخوڕیو بەرەو شوێنی کارەکەی دەڕۆیشت، لە ناکاو دووچاری کارەساتێکی دڵتەزێن بوو، جەڵتەیەکی دەماغی قـورس لێیـدا، بەڵام بەخت یاوەری بوو، لەو کاتەدا توانی ئۆتۆمبێلەکەی ڕابووەسـتێنێو پێـش ئەوەی لە هۆش خـۆی بچێت پەیوەندی بە کوڕەکەیەوە بـکات بۆ ئەوەی بێت بە هانایـەوە، هــەر ئەوەندەش ئاگای لە خۆی بوو، بۆ مـاوەی (٣) هەفتە بێهۆش بوو، دوای ئـەو ماوەیـە بە ئاگا هاتەوە، هەرچەندە کەسوکاری زۆر شـادمان بوون، بەڵام بەداخەوە ئـەو بوونەوەرێکـی تەواو جیاواز بوو لەگەڵ ڕابردوو، بـە تەواوەتی لە جووڵە کەوتووەو نەیدەتوانی هیچ ئەندامێکی جەستەی بجووڵێنێت، تەنانەت توانای قسەکردنیشی نەبوو، بە هۆی ئەو شەلەلەی دووچاری هەموو جەستەی هاتبوو، بەڵام ئەوەی جێگەی خۆشحاڵیبوو، ئەوەبوو هیچ زیانێك بەر ژیری نەکەوتبوو، پاش ماوەیەك زانی کە دەتوانێت پێڵوی چاوی چەپی بکاتەوە، توانی بەو تاکە چاوەو بە عەقڵی دروسـتی پلانێك دابنێ بۆ گەیشـتن بە ئاواتەکانـی، هەر بۆیە بڕیاریدا (هێمای نووسـین) دابهێنێت بۆ پیتەکان، تا بتوانێت ئەو شتەی لە دەروونیدایە دەریببڕێت، بە هۆی جووڵەی پێڵوی چاوییەوە بە جوڵەی جیاواز.

لـە پێنـاوی بەدیهێنانی ئەم ئاواتە دەگمەنەی چاوی کەوت بە یەکێك لە هاوڕێکانی، بە ئاماژە داوای یارمەتی لێکرد بۆ بە دیهێنانی ئاواتەکەی، ئەویش دوای ئەوەی لە داواکەی حاڵی بوو، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەڵێنی یارمەتی پێدا، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژانە (٣) کاتژمێر لە نەخۆشخانەدا پێکەوە کارییان دەکرد، بۆ گەیشـتن بە داهێنانێکی مێژوویی کە بریتی بوو لە (نووسـین بە هێما)! دوای ماوەیەك بۆ گەیشتن بە داهێنانی (نووسین بە هێما) توانیان سەرکەوتن بەدەستبهێنن، بۆ دەربڕینی ئەو شتەی لە دەروونیدایە، پاش ماوەیەکی تر هەستا بە دانانی کتێبێك لە ژێر ناونیشانی:

**(The Diving Suit The Butterfly)**

ئەم کتێبە لە (١٣٧) پەڕە پێکهاتووە، (٠٠٠ ٢٠٠) ئاماژەی چاوی تێدایە..

ئێستا دەپرسین: ئایا بیانوویەکی دروستو باوەڕپێکراو بۆ هیچ کەسێك هەیە دوای ناسینی (جون دومنیك بوبی)و (محەممەد یەساری)؟ لەو بڕوایەدا نیم هەبێت!

ئەوە محەممەدی یەسارییە، توانی تواناکانی دەستەچەپی بدۆزێتەوە، ئەوەش (جون دومنیك بوبی)ی فەرەنسییە، توانی تەنها بە چاوی چەپی ئەو داهێنانە مێژووییە دابهێنێت، ئەم دوو بەڕێزە لەگەڵ لایەنە تاریکەکانی ژیانیاندا توانیان لایەنە ڕووناکەکانی ژیانیان بدۆزنەوە!

ئەی ئەو کەسەی وادەزانیت کە نەخۆشی بەربەستێکی سەختەو لە کاروانی داهێنانو پێشکەوتنو گەشەپێدان دوات دەخات، دڵنیابە تۆ تاکە کەس نیت لەم جیهانەدا کە دووچاری نەخۆشی هاتوویت، کەسانێکی زۆر لە پێش تۆداو کەسانێکیش لە دوای تۆدا دووچاری هەمان ئازارو ناخۆشی هاتوونو دەبن، هەر کات چاوێك بگێڕیت بە سەر زەویدا نەخۆشو دەردەدارێکی زۆر دەبینیت، بەڵام گرنگ ئەوەیە تۆش وەك ئەم دوو کەسە لە کاتی نەخۆشیو نارەحەتیدا بگەڕێیت بۆ لایەنە ڕووناکییەکەی ژیانو بتوانیت بیدۆزیتەوە، لە بری خەمخواردنو ئاخ هەڵکێشان، لە بری هەڵوەرانی فرمێسکو دۆش دامان، بیر لە لایەنە ڕووناکەکەی بکەرەوەو کەسانی سەرکەوتوو بکە بە پێشەنگی خۆتو بزانە هەموو شتێك کە بەسەرت دێت لەم ژینەدا خێرێکی تێدایە! سەیرێکی مێژوو بکەو لە بلیمەتەکان وردبەرەوە کە کەمئەندام بوون، بەڵام بەناوبانگو بە توانا بوون، بۆ نموونە:

(شیخ بن باز) موفتی سعودی، نابینا بوو، نووسەری گەورە (مستەفا رافیعی) کەڕ بوو، فەرماندەی لەشکری ڕزگارکردنی باکوری ئەفریقاو ئەندەلووس (تاریقی کوڕی زیاد)، یەکێك لە سەرکردە بە ناوبەنگەکان کە لەگەڵیدا بوو ناوی (موسای کوڕی نوصەیر)بوو، شەل بوو... هتد، کە هەر یەکێکیان خاوەنی چیرۆکێکی سەرکەوتنو کاریگەرە کە دڵەکان دەهەژێنێت! گەشتێکن بۆ گەڕان بە دوای خەزێنەیەکی شاراوەدا، بۆ گەیشتن بە لایەنە ڕووناکەکەی ژیان! ئەوان پێی گەیشتنو توانیان ئەو لایەنە ڕووناکە بدۆزنەوە، هیوادارم ئێمەش بە نەخۆشو ساغمانەوە بتوانین لایەنە ڕووناکەکانی ژیانمان بدۆزینەوە!

کەواتە لە هەموو گرفتو ناخۆشییەکدا کە دووچارت دێت، بگەڕێ بۆ لایەنە ڕووناکەکەی، دڵنیابە لەگەڵ سووربوونو پێداگریت، دەگەیتە ئەو لایەنە ڕووناکەی کە لای تۆ شاراوەیە.

# پەرداخێك شەربەت، بۆ ژیانێکی ئاسوودە



هەمیشـــە لە گوزەرانو ژیانی هاوسەرێتی ناڕازیبوو، بەردەوام هەستی بە خەمو پەژارەو ماندووبوونو بێتاقەتی دەکرد، هەموو کات ســکاڵای لە دەســت هاوســەرەکەی دەکرد... پێی وابوو هاوســەرەکەی کەسێکی زۆر خراپەو مامەڵەو پێکەوە ژیانو بەردەوامی لەگەڵیدا زۆر ئاســتەمە، بۆ ئەم مەبەستەش چەند جارێك سەردانی پزیشکی دەروونی کردبوو، جارێکیان بۆ سکاڵا چووە لای پزیشکە تایبەتییەکەی خۆیو پێی گوت: بەڕێز جەنابی دکتۆر، هەرگیز کەمتەرخەمیم لەگەڵ هاوســەرەکەمدا نەکردووە، هەر کات ڕێگەم بکەوێتە بازاڕ دیارییەکی تایبەتــی بۆ دەکڕمو بە جوانترین شــێوە پێشکەشــی دەکەم، زۆر ڕۆژیــش پێکەوە دەچینە دەرەوە بۆ خواردنی نیوەڕۆ، یاخود ئێواران، بە گشــتی کەسێکی دڵنەرمو بەخشندەم لەگەڵ هاوســەرو منداڵەکانمدا، بەڵام هەموو ئەم ڕەفتارانەم نەبووەتە هۆی ئەوەی هەڵســوکەوتی خێزانەکەم لەگەڵمدا بگۆڕێت، ئیدی من بێزاربووەمو تاقەتی ژیانی هاوسەرێتیم نەماوە، هەر چییەکی بۆ بکەم هێشــتا ڕازی نییە، هەمیشــە دەم بە گلەییو ناڕازییە لە ژیانو گوزەرانی، ئافرەتێکی ئینکارو سەرســەختە، من لە هەر شــوێنێکی ماڵەکەدا دادەنیشم، ئەو ئەوشوێنە جێدەهێڵێت، بە درێژایی شــەوو ڕۆژ دوو قســەم لەگەڵدا ناکات، کردەوەو ڕەفتارەکانی وای لێکردووم کە نەك ڕقم لە پرۆسەی هاوسەرگیرییە، بەڵکو ڕقم لە ناوەکەشییەتی، تەنانەت ڕقم لە هەموو ئافرەتانیشە، چونکە وادەزانم هەموو ئافرەتێك هاوشێوەی هاوسەرەکەی منە.

ئایا ئیدی پێویستە ژیانی منو ئەو بەردەوام بێتو پارێزگاری لە ژیانی هاوسەرێتیمان

بکەم، لەگەڵ ئەو هەموو نارەحەتییەدا؟ پاشان ماوەیەك بێدەنگ بوو، دکتۆرەکە بە تەواوی گوێی لە قسەکانی گرت، پاشان مۆڵەتێك دروست بوو بۆ چوونە ژوورەوە بۆ نێو بابەتەکە، دکتۆرەکە دەڵێت: سەرەتا وتم: با کەمێك واز لەم بابەتە بهێنین، دوو قسەی خۆش بکەین، حەزت لە چ جۆرە شەربەتێکە، شەربەتی پرتەقاڵ، یان شەربەتی شیلك؟

کابرا وتی: نامەوێت هیچ شتێك بخۆمەوە، ئەوەی من نۆشیم لە تاڵایی ژین لەگەڵ خێزانەکەمدا بەسە، ئیدی پێویست ناکات شەربەت بنۆشم! کورد وتەنی: (هەنگوین لە زارمدا وەك ژەهری مارە).

دکتۆرەکە وتی: من سورم لەسەر پرسیارەکەی خۆم، ئێستا پێم بڵێ، حەزت لە کام شەربەتەیانە؟

کابرا وتی: ئەگەر هەر پێداگری دەکەیت، با شەربەتی پرتەقاڵ بێت.

وتم: ئایا دەتەوێت لە پەرداخێکی شووشەدا نۆشی بکەیت، یان پلاستیك، یان لە دەفرێکی کانزاییدا؟

کابرا وتی: لە پەرداخێکی شووشەدا.

وتم: ئایا دەتەوێت لە پەرداخێکی پاكوخاوێندا بێت، یاخود بەلاتەوە ئاساییە ئەگەر پەرداخەکە شوێن پەنجەی پێوە دیار بێت؟

کابرا وتی: نا، دەمەوێت لە پەرداخێکی پاكوخاوێندا بێت، نەك پیسو شوێن پەنجەی پێوە دیار بێت.

وتم: ئایا دەتەوێت پەرداخەکە لەسەر سینییەکی پلاستیك بێت، یان سینییەکی کانزایی؟

کابرا وتی: با لەسەر سینییەکی کانزایی بێت.

وتم: لات ئاساییە ئەگەر سینییەکە کەمێك ژەنگی پێوە بێت؟

کابرا وتی: نەخێر، بەڵکو حەزدەکەم لەسەر سینییەکی پاکوخاوێن بێتو هیچ ژەنگێکی پێوە نەبێت.

وتم: ئایا دەتەوێت سینییەکە زیپوی بێت، یان ئاڵتوونی، یا تێکەڵاو لە هەر دووکیان؟

کابرا وتی: دەمەوێت لەسەر سینییەکی ڕەنگ زیپوی بێت.

وتم: ئایا دەتەوێت پەرداخە شەربەتەکە لە ژوورێکدا نۆش بکەیت کە ئامێری فێنککەرەوەی تێدایەو کەشێکی خۆشی هەیە، یان لە ژوورێکی گەرمدا؟

کابرا وتی: بێگومان، دەمەوێت لە ژوورێکدا نۆشی بکەم کە ئامێری فێنککەرەوەی تێدایەو کەشێکی خۆشی هەیە.

وتم: ئایا دڵخۆش دەبیت کە ژوورەکە پەنجەرەی فراوانی تێدا بێتو ڕووناکیو جوانی بەخشیبێت بە ژوورەکە؟

کابرا وتی: بەڵێ دەمەوێت ژوورێك بێت پەنجەرەی لەسەر بێتو دیمەنێکی جوانی هەبێت.

وتم: ئایا دەتەوێت بە پێوە شەربەتەکە بخۆیتەوە، یان لەسەر کورسییەکی جوانو فراوان دابنیشیت؟... کابرا وتی: بێگومان لەسەر کورسییەکی فراوانو جوان.

وتم: ئەمە ئەوەیە کە تۆ دەتەوێت تا پەرداخێك شەربەت نۆش بکەیت، کابرا وتی: بەڵێ.

وتم: ئەگەر من لە بری پەرداخێك شەربەتی پرتەقاڵ، پەرداخێك شەربەتی شیلکت پێشکەش بکەم، بەو بیانووەی پرتەقاڵ لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا هەیەو لە هەموو شوێنێك دەستدەکەوێت، بەڵام شیلك تازەیەو تەنها لەم وەرزەدا هەیەو تاڕادەیەك شەربەتێکی دەگمەنە، هەروەها پەرداخەکە شوێن پەنجەی پێوەدیاربێت، بەو بیانووەی ئەو شوێن پەنجانە لە بەشی دەرەوەی پەرداخەکەیە نەك لە ناوەوە، لەسەر سینییەکی پلاستیکیش بێت بەو بیانووەی سینی تر پەیوەندی بەشەربەتەوە نییە، لە ژوورێکی گەرمدا، چونکە کەشی فێنكو سارد زیانی بۆ تەندروستی هەیە، کورسیشت بۆ دانانێم لەسەری دابنیشیت، بەو بیانووەی کاتت زۆر بە فیڕۆ نەدەم، چونکە کات ئاڵتوونە، یان کات وەکو شمشێر وایە ئەگەر نەیبریت، دەتبڕێت، هەروەها ژوورەکە پەنجەرەشی تێدا نەبێت، لەبەرئەوەی پەنجەرەی زۆر بیرو هۆشت پەرتەوازە دەکات، ئەگەر من هەموو ئەمانەم بەم ڕێگاو شێوازەی خۆم کە من پێی ڕازیم، پێشکەش کردی، نەك بەو ڕێگەیەی کە تۆ دەتەوێت، ئایا تۆ بەو میواندارییەی من دڵخۆش دەبیت؟

کابرا وتی: بێگومان نەخێر. وتم: کەواتە من دەترسم لەوەی تۆ زۆر شتت پێشکەشی خێزانەکەت کردبێت، بەڵام بەو ڕێگەیەی کە خۆت پێتخۆشەو لێی ڕازیت، نەك بەو ڕێگەیەی کە هاوسەرەکەت دەیەوێتو لێی ڕازییە!

هەروەها تۆ دەتەوێت ئەو وەکو تۆ وابێت، بێگومان ئەمەش بەڵاو نەهامەتییەکان زیاد دەکات، خۆ ئەگەر هاوسەرەکەشت هەمان ئەو ڕێگەیە بگرێتە بەر کە تۆ گرتووتەبەر، ئەوا هەر یەکەتان بە ئاڕاستەیەکی جیاوازدا دەڕۆن. ئەو کات لە یەکگەیشتنتان یەکجار دوور دەبێت.

کابرا کاتێك گوێبیستی ئەم ڕوونکردنەوانە بوو، سەری هەڵبڕیو وتی: زۆر ڕاستە گرفتە سەرەکییەکە ئەوەیە کە لە نێوانی منو هاوسەرەکەمدا ڕوودەدات.. هەر یەکەمان بەو شێوازە مامەڵە لەگەڵ یەکدی دەکەین، کە خۆمان دەمانەوێت!!

# ئاكامى بڕوا بەخۆنەبوون

هەندێك لە خەڵكی وادەزانن نەریتو ئاكار بریتییە لەوەی كە لەسەری دروست بوویت، ئەم بنەمایە لە هزریاندا وێنا دەكەنو وادەزانن بنەمایەكی نەگۆڕەو ناكرێت بگۆڕدرێت... لەبەرئەوە تەسلیمی واقیع دەبنو قەناعەتی پێ دەكەن، هەروەكو چۆن تەسلیمی درێژی باڵایان، یان ڕەنگی ڕووخساریان دەبنو بڕوایان وایە ناكرێت باڵا بگۆڕدرێت...

لەگەڵ ئەوەشدا كەسانی زیرەكو لێهاتوو پێیان وایە گۆڕینی سروشتو هەڵسوكەوتی مرۆڤ لە گۆڕینی جلوبەرگ ئاسانترە، سروشتمان وەكو شیری ڕژاو نییە كە ناتوانرێت كۆبكرێتەوە، بەڵكو سروشتو هەڵسوكەوت بە دەست خۆمانەوەیە، بەڵام كەسانێك هەن كە متمانەیان بە خۆیان نییە، بە زوویی دەكەونە ژێر كاریگەری دەوروبەریانەوە، هەر كاتێك كارێك ئەنجام دەدەن، یان دەیانەوێت بڕیارێك لەسەر چارەنووسی خۆیان بدەن، ئەگەرچی ماوەیەكی زۆر بیر لەو بابەتە دەكەنەوە، بەڵام كاتێك ڕەخنەیان لێ دەگیرێت، دەكەونە گومانەوەو وا دەزانن ئەوان لە هەڵەدان...

ئیبن حەزم لە كتێبی كۆتی كۆتردا «طوق الحمامة» دەڵێت: لە وڵاتی ئەندەلوس بازرگانێكی بە ناوبانگ هەبوو، چوار بازرگانی هاوڕێی كێبڕكێیان لەگەڵدا دەكرد، زۆریش ڕقیان لێی بوو... بەردەوام هەوڵیان دەدا بێزاری بكەن..

ڕۆژێكیان ئەم بازرگانە بە ناوبانگە كراسێكی نوێی سپیو عەمامەیەكی جوانی پۆشیو زۆر بە دڵ خۆشییەوە بەرەو نووسینگەی كارەكەی ڕۆیشت، لە ڕێگادا یەكێك لەو چوار

بازرگانەی پێگەیشت، سڵاوی لێکردو سەیرێکی عەمامەکەی کردو پێی وت: بە ڕاستی ئەو عەمامە زەردە زۆر جوانە، پیرۆزت بێت!

بازرگانەکەش پێی وت: چاوت نابینێت؟ ئەو عەمامەیە سپییە نەك زەرد...

ئەویش وتی: نەخێر زەردە، بەڵام زۆر جوانە... بازرگانەکە چیدی چەلەحانێی لەگەڵ نەکردو ڕۆیشت بەرەو نووسینگەکەی، چەند هەنگاوێك دوورکەوتەوە، گەیشت بە یەکێکی دیکە لەو چوار بازرگانە، ئەویش سڵاوی لێکردو سەیرێکی عەمامەکەی کردو بە سەرسوڕمانەوە پێی وت: بەڕاستی ئەمڕۆ زۆر جوانیت، جلوبەرگەکانت زۆر نایابە، بە تایبەت ئەو عەمامە سەوزەت، یەکجار جوانە، پیرۆزت بێت...

بازرگانی بەناوبانگ وتی: پیاو، عەمامەکەم سپییە نەك سەوز!

وتی: نەخێر، سەوزە! بازرگانەکەش بە توڕەییەوە وتی: من دەڵێم سپییە، دوورکەوەرەوە لێم، بە خەمەوە ملی ڕێگەی گرت، بە تەواوی لە عەمامەکەی کەوتە گومانەوە بە تیلەی چاو سەیرێکی عەمامەکەی دەکرد تا دڵنیابێت لە ڕەنگی عەمامەکەی!

بە هەر حاڵ گەیشتە نووسینگەکەی، قوفڵی نووسینگەکەی کردەوەو چووە نێو نووسینگەکەی، بازرگانی سێیەم هاتو بە هەمان شێوەی هاوڕێکانی سڵاوی لێکردو بە سەرسوڕمانەوە پێی گوت: ئەم بەیانییە چەند جوانی، بە تایبەت جلەکانت هەر زۆر جوانە، ئەوەش کە زیاتر جوانی کردوویت ئەو عەمامە شینەیە، بازرگانەکەش سەیرێکی عەمامەکەی کرد تا دووبارە لە ڕەنگەکەی دڵنیا بێت، پاشان بە چاوێکی ڕقاوییەوە سەیری کردو پێی وت: براکەم عەمامەکەم سپییە نەك شین!

بازرگانی سێیەم وتی: نەخێر ڕەنگی عەمامەکەت شینە، بەڵام نیگەران مەبە بە شێوەیەکی گشتی زۆر جوانە.

پاشان ماڵئاوایی لێکردو نووسینگەکەی بە جێهێشت، بازرگانە بە ناوبانگەکەش هاواری کرد، عەمامەکەم سپییە، عەمامەکەی لە سەری داگرتو سەیری کردو ئەمدیواو دیوی کرد، هەرچەندە لە عەمامەکەی ورد دەبووەوە، زیاتر دڵنیا دەبوو کە ڕەنگی عەمامەکەی سپییە! ئەو بەیانییە بە تەواوی مەزاجیان تێکدا، چووە سەر کورسی نووسینگەکەیو دانیشت، بەردەوام سەیری لایەکی عەمامەکەی دەکردو لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەم عەمامەیە سپییە ئیدی بۆچی ئەم بازرگانانە هەر یەکە بە ڕەنگێك دەیبینێت؟ لەو کاتانەدا بازرگانی چوارەم هات بۆ لای، ئەویش بە هەمان شێوە زۆر بە گەرمی سڵاوی لێکردو وتی: ئەو عەمامە سورەت لە کوێ کڕیوە؟ بازرگانەکە هاواری کرد بە سەریداو وتی: عەمامەکەم سپییە، بازرگانی چوارەم زۆر بەهێمنییەوە وتی: نەخێر سورە...

پاشان بازرگانی بە ناوبانگ وتی: سەوزە، نەخێر، نەخێر، سپییە، نەخێر شینە، ڕەشە، ئیدی دەستیکرد بە پێکەنین، پاشان هاواری کرد، دوای ئەوە دەستیکرد بە گریان، لە ئەنجامدا هەستاو نووسینگەکەی جێهێشتو ڕایکرد...

ئیبن حەزم دەڵێت: سەرەنجام ئەو بازرگانە دەوڵەمەندەم بینی بە نێو شەقامەکانی ئەندەلوسدا بە شێتی دەسوڕایەوەو منداڵان گاڵتەیان پێدەکرد.. سەرنج بدە چوار بازرگان بە پێی پیلانێکی سادە، توانیان سروشتی ئەو کابرایە بگۆڕن، نەك هەر سروشتی، بەڵکو عەقڵیشیان گۆڕی.

ئەگەر مرۆڤ بڕواو متمانەی بە خۆی هەبێت، هیچ کات دووچاری ئەم جۆرە ڕووداوو کارەساتانە نابێت، ئەگەر کاکی بازرگان، من، تۆ، هەموومان، بڕوامان بە خۆمان هەبێت، جلوبەرگێك، یان ڕەنگێك بە لای ئێمەوە جوان بێت، با لای هەموو خەڵکی ناشیرین بێت، بۆ دەبێت قسەو گوتەی خەڵکی دوودڵو ڕاڕامان بکات لەو جلوبەرگەی کە لەوانەیە چەندین دوکان گەڕابین تا ڕەنگێکمان بە دڵی خۆمان هەڵبژاردووە، لەوانەیە جلوبەرگیش شتێکی ئاسایی بێت، بەڵام کارەکە تەنها لە جلوبەرگدا کورت هەڵناهێنێت، زۆرجار ئەم ڕووداوە کاریگەری نێگەتیفی لەسەر شتە چارەنووسسازەکانی ژیان دەبێت، زۆرجار دەبینین کوڕێك، یاخود کچێك، چەندین ساڵ عەوداڵی هەڵبژاردنی هاوسەرێکە کە لە هزری خۆیدا وێنای کردووە، دواجار کەسێك بە دڵی خۆی، بە چاوی خۆی، هەڵدەبژێرێتو بڕیاری پێکەوە ژیانو بەستنی گرێبەستی هاوسەرێتی لەگەڵدا دەدات، بەڵام کاتێك خوشکێکی، یان یەك لە دۆستانی چاوی بە کچەکە دەکەوێت، لە بری پیرۆزباییو هیواخواستنی بەختەوەری بۆ هەردووکیان، هەزارو یەك ڕەخنە لە کچی داماو دەگرێت، کوڕی بێچارەش ئەگەر پەشیمانیش نەبێتەوە دەکەوێتە گومانێکی زۆرەوە لەسەر ئەو کەسەی کە چەندین ساڵە خەون بەو ڕۆژەوە دەبینێت، کە ئەو ئافرەتە ببێتە هاوسەری، جاری واش هەیە کار دەگاتە هەڵوەشانەوەی کارەکەیان، هەموو ئەمانەش لە ئەنجامی قسەو قسەڵۆکی پیاو باشانەوە بوو!

لە کۆتاییدا دەڵێین: جوانی لای هەر کەسێك پێناسەیەکی هەیە، ئەو ڕەنگەی، یان ئەو ڕووخسارەی لای تۆ جوانە، ڕەنگە لای بەرامبەر بەو شێوەیە جوان نەبێت، لەبەرئەوە ناگونجێت هەموو دنیا یەك ڕەنگیان بە لاوە جوانو پەسەند بێت، هەروەك چۆن ناکرێت هەموو دنیا وەك یەك بیر بکەنەوە، جوانیش هەر وایە!

کەواتە با هەر یەکەمان بڕوامان بە خۆمان هەبێتو قسەو قسەڵۆکی کەسانی ڕەشبینو بیر تەسك کارمان تێ نەکەن، تا نەبینە قوربانی بیرو بۆچوونەکانیان!

# هاوڕێی نیوەڕێ..



بازرگانێکــی دەوڵەمەند، تەنهــا خاوەنی یەك کوڕ بوو، بەڵام کوڕەکەی کەســێکی زۆر بێبەرنامــەو بــێ پلان بوو، هەمیشــە بە دوای کاری خراپو نەشــیاوەوە بوو، هاوڕێیەتی کەســانێکی دەکرد کە نە بــۆ دنیاو نە بۆ ئاخیرەت بە کەڵــك نەدەهاتن، هەموو جارێك باوکی ئامۆژگاری دەکردو پێی دەگوت: هاوڕێیەتی کەســانی خراپ مەکە، چونکە (هاوڕێ لەســەر دینی هاوڕێکەیەتی)، بەڵام سوودی نەبوو، قسەکانی باوکی لەم گوێیەوە دەبیستو لەو گوێیەوە دەهاتەدەر.. بازرگانەکە زۆر خەمی بۆ حاڵی کوڕەکەی دەخوارد، هەمیشە بە خــۆی دەگــوت: ئەم کوڕەم ئەوە ڕەفتاری بێو ئەوانەش هاوڕێی بن، لە پاش من دووچاری ژیانێکی سەختو دژوارو ناڕەحەت دەبێت!

ڕۆژێك بازرگانەکە هەزار سکەی زێڕی خستە ناو سەقفی یەکێك لە ژوورەکانی ماڵەکەیداو لەوێدا قایمی کرد، پاشان ڕۆیشت بۆ لای کوڕەکەیو پێی گوت: کوڕی شیرینم، ئەگەر دوای من دووچاری دەردەسەریو ناڕەحەتی بوویتو سەختی ڕۆژگار تەنگیان پێهەڵچنیت، تا ئەو ئەندازەی ئەگەر ویستت خۆت بکوژی، ئەوا گوریسێك بە ئەڵقەی ناوەڕاستی فلانە ژووردا هەڵواســە، پاشان بچۆرە سەر تەپڵەکێكو گوریسەکە بخەرە گەردنتەوەو تەپڵەکەکە لەژێر پێت لاببە، ئەمجۆرە مردنە لە هەموو مردنێك ئاسانترو باشترە!

کوڕە بازرگان بە قسەکانی باوکی زۆر پێکەنی، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: (باوکم شێت بووە، مەگەر مرۆڤی ژیر بە دەستی خۆی، خۆی دەکوژێت، وا باوکم فێری خۆکوشتنم دەکات)!!

ڕۆژان هاتو ڕۆی، قەدەر وابوو بازرگان بۆ دواجار ماڵاوایی لە ژیان کردو بۆ هەمیشە چاوەکانی لێکنان، کوڕەکەی سەروەتێکی زۆری بۆ بەجێما، لەبری کارکردنو برەودان بە سەروەتەکەی باوکی، دەســـتیکرد بە خەرجکردنو خواردنی، ئەو سەروەتەی باوکی بە درێژایی ژیانی کۆیکردبووەوە، لە ماوەی یەك ساڵدا هەمووی لە پێناوی ئارەزووەکانی خۆیو هاوڕێ نەگریسەکانیدا خەرجکرد، دوای تەواوبوونی دینارو درهەم، کەوتە فرۆشـــتنی کەلوپەلی ناوماڵەکەیان، ئەمڕۆ فەرشەکانی دەفرۆشتو سبەی کەلوپەلی عەنتیکەی دەفرۆشتو ڕۆژێکی تر کۆیلەو ڕۆژی دواتر کەنیزەك.. هتد، هەتا وای لێهات لە ماڵەکەیاندا هیچ شتێك نەما بۆ فرۆشتن!

کوڕە بازرگان نەیدەزانی دوای ئەوە چی بکات!! لەو ســـاتو کاتەدابوو، هاوڕێکانی هەواڵیان دابوویە، ئەمشەو لە فلانە باخچە میوانی تۆ دەبین، خواردنمان بۆ ئامادە بکەو وەرە بۆ لامان)..

دوای ئەوەی لە ماڵەکەدا زۆر گەڕا هیچ شتێکی دەستنەکەوت، تا بیبات بیفرۆشێت، ڕۆیشت بۆ لای دایکی، دەستیکرد بە گریانو وتی: (ئەمشەو میوانم هەیە، هیچ شتێکم نییە میوانداریيەکەی پێ بەڕێ بکەم، ئەگەر چارەیەکم نەکەیت لەبەرچاوی دۆستو دووژمن ئابڕوم دەچێت)!!

دایکی دڵی بە حاڵی کوڕە تاقانەکەی سوتاو ڕۆیشتە بازاڕو بڕێك لە ئاڵتونەکانی فرۆشتو خواردنـــی بۆ میوانەکانی کوڕەکەی کڕیو بەهەر چەشـــنێ بێت پێداویســـتی میوانەکانی جۆرکرد، خواردنەکەی بۆ خستە بوخچەیەکەوەو دایەدەستی، تا بۆ میوانەکانی ببات.

کوڕەکـــەی زۆرخۆشـــحاڵ بوو، بوخچەکەی هەڵگرتو بەرێکـــەوت بۆ ئەو باخچەیەی کە بەڵێـــن بوو میوانداری هاوڕێکانی تێـــدا بکات، لە ڕێگەدا زۆر ماندووبوو، بوخچەکەی داناو لە ژێر ســـێبەری درەختێکدا دانیشت، تا پشووبداتو بحەوێتەوەو پاشان دەست بکاتەوە بە ڕۆیشتن. لەو کاتەدا سەگێك بۆ پەیداکردنی ژەمە خۆراکێك سەری کرد بە نێو بوخچەکەدا، کوڕە بازرگانەکە بەردێکی تێگرت، سەگەکە دەستبەجێ بوخچەکەی کرد بە ملیداو ڕایکرد، کوڕەکە زۆر بە خێرایی ڕایکرد بە دوای سەگەکەدا، بەڵام نەیتوانی بە سەگەکە بگاتەوە..

بە دڵێکی پڕ لە خەمو چاوی پڕ لە ئەســـرینەوە ڕۆیشـــت بۆ لای هاوڕێکانیو تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، کەسیان بە قسەکانی کوڕە بازرگان باوەڕیان نەکرد، دوای ئەوە هەموویان ڕۆیشتن بۆ ئامادەکردنی خواردن، دانیشتنو دەستیان کرد بە نانخواردن، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو، ئەوەبوو کە خواردنیان بە کوڕە بازرگانەکە نەداو نەیانهێشت بچێتە ناویانەوە!! ئا لەو کاتەدا کوڕە بازرگانەکە بە خۆیدا چووەوەو تێگەیشت کە سەروەتو سامانی باوکی بۆ چ کەسانێك خەرج کردووە، هەر

بۆیە بڕیاری دا کە خۆی بکوژێت، لە دەستی ئەم ژیانەو ئەو دۆستو هاوڕێ بێ وەفایانەی ڕزگاری ببێــت، لەو کاتەدا وەســییەتەکەی باوکی بەبیرهاتــەوە کە پێی گوتبوو هەر کات لە ژیان بێزار بوویتو ســەختی ڕۆژگار تەنگی پێهەڵچنیتو ویستت خۆت بکوژی، بڕۆ بە ئەڵقەی ناوەڕاستی فلانە ژوورەوە خۆت هەڵواسە!

کوڕەکــە لــە دڵی خۆیدا گوتی: لە ژیانمدا هیچ کات گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی باوکم نەبووم، لە بەرامبەردا زیانی زۆرم چەشــت، ئێســتا چ عەیبی هەیە ئەگەر وەســیەتەکەی باوکم جێبەجێ بکەم، کە لانی کەم لە دنیادا کەمتر شەرمەزار دەبم!

گەڕایەوە ماڵ، گوریسو تەپڵەکی ئامادەکردو چووە ئەو ژوورەی کە باوکی پێی وتبوو، گوریسەکەی بەســت بە ئەڵقەکەوە، پاشان گوریســەکەی خستە ملییەوەو تەپڵەکەکەی لە ژێر قاچی خۆی لابرد، لەو کاتەدا ئەڵقەکە کەوتە خوارەوەو کوڕەکە کەوتە سەرزەوی، سکە زێڕەکان ڕژان بەسەریدا!!

کوڕە بازرگان بەم دیمەنە زۆر سەرسام بوو، تێگەیشت کە هەموو ئەو سکە زێڕانە باوکی لەو شــوێنە دایناوەو ویستویەتی کوڕەکەی لە کاتێکدا کە دووچاری دەردەسەریو هەژاریو نائومێدی دەبێتو تێدەگات کە هاوڕێکانی کەسانی هەلپەرستو چاوچنۆکن، لەو کاتەدا ئەم سکە زێڕانە ببێتە هۆی گەڕانەوەی ئومێدو ڕزگاربوونی لە هەژاریو دەردەسەری ژیان، ئەو کات تێگەیشت کە باوکی تا چ ئەندازەیەك دۆستی ڕاستەقینەو خەمخۆرو دڵسۆزی بووە..

دواتر تەواوی سکە زێڕەکانی کۆکردەوەو ڕۆیشت بۆ لای دایکی، بینی دایکی دەستەو ئەژنۆ لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا دانیشتووەو خەم بووەتە میوانی! کوڕەکە سکەیەکی زێڕی دایە دەستی دایکیو وتی: دایەگیان هەستە خواردنێکی باشمان بۆ ئامادە بکە، تا پێکەوە نۆشی بکەین!

دایکــی بە بینینی ســکە زێڕەکە زۆر خۆشــحاڵ بوو، بەسەرســوڕمانەوە پرســی: ئەم سکەیەت لە کوێ هێنا؟ کوڕەکە گوتی: دوای ئەوەی هەموو کاروبارمان ڕاوەستاو هیچ پارەو سامانێك، تەنانەت هیچ کەلوپەلێکی ناوماڵمان نەما، دیارە ویستی خودا وایە کە جارێکی دیکــە، ژیانو گوزەرانو کاروبارمان وەکو جــاران بگەڕێتەوەو پەند لە ڕابردوو وەربگرین، دوای ئەوە دەزانم چۆن ژیان بگوزەرێنمو دۆستو دوژمن بە باشی دەناسم.

دایکی گوتی: سوپاس بۆ خودا، کە سەرەنجام هۆشت هاتەوەو تێگەیشتیت کە هاوڕێکانت کێن، ئێستا پێم بڵێ ئەو سکە زێڕانەت لە کوێ هێناوەو ئەم قسانە کێ فێری کردوویت؟

کوڕەکە گوتی: ئەو سکە زێڕانە باوکم پێیداوم، ئەو قسانەش هەر باوکم فێری کردم!

دایکی گوتی: لەم سەودایە تێناگەم، باوکت ساڵێکە کۆچی دوایی کردووە؟

کوڕەکە تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە، ئیدی بەڵێنی دا کە ژیانو گوزەرانیان دووبارە باش بکاتەوەو بە وێنەی ئەو ژیانەی کە باوکی بۆی فەراهەم هێنابوون.

کوڕە بازرگانەکە بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆیشتە بازاڕو هەموو ئەو شتانەی کە فرۆشتبووی، بە زیادەوە کڕییەوەو هێنایەوە بۆ ماڵ، پاشـان ڕۆیشت دوکانەکەی باوکی کردەوەو بە وێنەی باوکی دەستیکرد بە بازرگانیکردن.

هاوڕێکانـی کاتێك هەواڵیان بیسـت کـە ژیانو گوزەرانی کوڕە بازرگان زۆر باشـبووە، دووبارە هاتنەوەو دەوریان لێدا، کوڕەکەش جارێکی دیکە تێکەڵاوییان بووەوەو بە گەرمی بەخێرهاتنـی کردن، ئەوانیش وەکو جاران لەگەڵیدا گەرموگوڕبوونەوە، ڕۆژێك هەمووانی بۆ خوانی نیوەڕۆ بانگهێشتکرد بۆ هەمان ئەو باخچەیەی پێشوو..

ڕۆژی میوانـی هاتـە پێش، کوڕە بازرگان بە دەسـتی خاڵی چوو بـۆ لایانو پێی وتن: هاوڕێیان ببورن ئەمڕۆ چێشتلێنەرەکەمان سەرقاڵی دروستکردنی کفتە بوو، دەیویست بۆ نانی نیوەڕۆ کفتەمان بۆ دروست بکات، مشکێك هاتو گۆشتە قیمەکەی هەڵگرتو فڕاندی..

یەکێك لە هاوڕێکانی گوتی: هەفتەیەك پێش ئێسـتا چێشتلێنەرەکەی ئێمەش گۆشتی دەدا لە قیمە، مشکێك قیمەکەی لێفڕاند.

یەکێکـی دیکەیـان گوتـی: ئەوە هیـچ نییە، چەنـد ڕۆژێـك لەمەوبەر مشـکێك هاتە نێو چێشـتخانەکەمانەوە، چێشـتلێنەرەکەمان ویسـتی زیرەکی خۆی بنوێنێت، دوای کەوت لێرە بۆ ئەوێ، تا خۆی کرد بەناو کونەکەیدا، ئیتر دوای ئەوە هەواڵمان لێنەما ئاخۆ زیندووە، یا تۆپیوە..

کوڕە بازرگان، هەموو ئەم قسانەی بیست، پاشان وتی: (باشە بۆچی ئەو ڕۆژەی کە وتم سـەگ بوخچەکەمی بردووە، هیچ کام لە ئێوە بـاوەڕی پێنەکردم، تەنانەت منتان لەگەڵ خۆتان بانگ نەکرد بۆ نانخواردنیشو ڕێگەتان نەدا لەگەڵتان دابنیشم؟).

کەسیان وەڵامیان نەدایەوە، بە تەریقییەوە سەیری یەکتریان دەکرد..

کوڕەکە وتی: بەڵێ، ئەو ڕۆژەی کە من داماوو بێچارەو بێ پارە بووم، قسەی ڕاستم گوت، بەڵام کەستان باوەڕتان پێنەکردم، بەڵام ئەمڕۆ کە ماڵو سامانم هەیە درۆکانم قبوڵ دەکەنو بەڕاستی دەزانن، بۆ دڵدانەوەو دڵخۆشکردنی من، ئەو هەموو درۆ شاخدارەتان ڕێکخست..

ئێوە وانەو پەندێکتان فێری من کرد، کە تا ڕۆژی قیامەت لە بیری نەکەم!

دوای ئەوە گەڕایەوە سەر دووکانو بازرگانییەکەی خۆیو بەردەوام بوو لە بازرگانیکردن، تا ئەو ساتەی بووە یەکێك لە بازرگانە دەوڵەمەندو ناودارەکانی ئەو شارە!



# هاوڕێ دەگمەنەکان!

ئەو مرۆڤەی هاوڕێیەکی دڵسۆزو بە وەفاو خەمخۆری نییە، وەکو جەستەیەکی بێ ڕۆح وایە.. گرنگ نییە ئێمە چەند هاوڕێمان هەیە، گرنگ ئەوەیە بزانین هاوڕێکانمان کێن؟

لـەم زەمانــەدا هاوڕێیانی بە وەفاو بە ئەمەكو دڵسـۆزو خەمخۆر، دراوێکی دەگمەنن، هاوڕێــی ڕاســتەقینە گەنجینەیەکی بە نرخە، تکایە پارێزگاری لــەو گەنجینەیە بکە، لە دەستی مەدە چونکە دەستکەوتنەوەی ئەستەمە!

چەندە جوانە ئەو هاوڕێیەتیەی پاكو بێگەردو دوور لە بەرژەوەندی ماددیو مەرامە، ژیان چەندە خۆشــە لەگەڵ هاوڕێ دەگمەنەکانت، بەڵام چەندە سەختە بەبێ هاوڕێیەتی، یان لەگەڵ هاوڕێی بێ وەفا!!

هاوڕێی ڕاســتەقینە لە خۆشــیو ناخۆشــی، لە شینو شایی، بەشــداریت دەکات، هاوڕێی ڕاســتەقینە هەمیشــە لــە کاتــی ناخۆشــیدا لــە تەنیشــتی هاوڕێکەیەتــی، هەرگیز لێی دوورناکەوێتەوە.. هاوڕێی ڕاستەقینە ئەگەر هەڵەت کرد، مالآواییت لێناکات، بەڵکو لێبوردنت پێشــکەش دەکات، هاوڕێی ڕاستەقینە هەمیشــە هەواڵت دەپرسێ، لێت بێزار نابێت، ئەگەر زیــزی کردی ناخەوێت تا ئەو ســاتەی ئاشــتت دەکاتەوە.. لە هەمــووی گرنگتر ئەوەیە کە هاوڕێی ڕاستەقینە بەبێ هیچ مەرامو بەرژەوەندییەکی ماددیو مەعنەوی تۆی خۆشدەوێت..

بەڵام ئایا دەگونجێت هەموو کەس بکەیتە هاوڕێی خۆت؟

ئەم پەندە زۆرجوانە کە دەڵێت: پێم بڵێ هاوڕێکەت کێیە، پێت دەڵێم تۆ کێی!

لەبەرئەوە پێویستە کەسانی ڕەوشتبەرزو ئاکار جوانو ڕاستگۆو بە وەفاو داوێنپاکو دەستپاکو زمانپاکو ئەمین هەڵبژێرین، بۆ ئەوەی بیانکەینە هاوڕێی خۆمان، چونکە هاوڕێ ئاوێنەی هاوڕێکەیەتی، ئەگەر لە هەڵبژاردنی هاوڕێدا سەرکەوتوو نەبووی، ئەوا دەبێت ئەوە بزانیت تۆ لە بری هاوڕێ دوژمنت هەڵبژاردووە!!

پێغەمبەری ئازیز (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: هاوڕێ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، با هەر یەك لە ئێوە بزانێت هاوڕێیەتی کێ دەکات..

نموونەی هاوڕێیانی ڕاستگۆو بە وەفا لە مێژوودا تۆمار دەکرێو دەبێتە چیرۆكو لە ڕووپەڕی کتێبو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا پەخش دەکرێو هەزاران کەس دەیخوێننەوەو سوود لە هەڵوێستو وەفادارییان وەردەگرن..

**با پێکەوە چیرۆکی ئەم دەستە هاوڕێیانە بخوێنینەوە:**

کوڕێك لە سەرەتای تەمەنی لاوێتییەوە پزیشکەکان پێیان ڕاگەیاند کە دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە هاتووە، چەند هەفتەیەك لە نەخۆشخانەی تایبەت خەوێنراو لە ڕێگەی تیشكو چارەسەری کیمیاوییەوە چارەسەری بۆ کرا.. لە کاتی وەرگرتنی چارەسەرە کیمیاییەکاندا، تەواوی تاڵە ڕەشەکانی قژی لە دەستدا، ئەو ڕۆژەی لە نەخۆشخانە هاتەدەر، لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ ماڵ، هەستی بە نیگەرانیو دوودڵی دەکرد، نەك بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە، بەڵکو هەستی بە شەرمەزاری دەکرد کە چۆن بەسەری کەچەڵەوە بڕواتە نێو هاوڕێکانییەوە، چۆن بڕواتەوە بۆ قوتابخانە، بڕیاری دا بۆ ئەو مەبەستە کڵاوێك بکاتە سەریو هەرچۆنێك بێت بڕواتەوە بۆ قوتابخانەکەیو درێژە بە خوێندنەکەی بدات..

لەم خەیاڵانەدا بوو، ئۆتۆمبێلەکە لەبەردەرگای ماڵەکەیاندا وەستا، دابەزیو بەرەو ماڵ هەنگاوی نا، لە ناکاو شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەری بینی.. بینی نزیکەی پەنجا کەس لە هاوڕێکانی بە یەکەوەو لەبەردەگای ماڵ پێشوازییان لێکردو پێکەوەو بە یەك دەنگ گوتیان: بەخێربێیتەوە بۆ ماڵ، بەخێربێیتەوە بۆ ناومان!

ئەم لاوە سەیرێکی کردن، بە چاوەکانی خۆی بڕوای نەدەکرد، هەموو ئەو پەنجا هاوڕێیەی سەریان سفر کردبوو.. تەنها بۆئەوەی هاوڕێکەیان خەمبارو نیگەران نەبێتو بێتاقەت نەبێت! ئەوە هاوڕێیەتی ڕاستەقینەیە، هەستکردن بە ئازارو خەمەکانی یەکتری، هاوسۆزیو هاوخەمی یەکتر..




# سەرەنجامی هاوڕێی خراپ

(سـامی) لە تاقیکردنەوەی کۆتایی سـاڵ تەواو بوو، پێش ئەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکان وەربگرێتـەوە، لە باوکی پرسـی: ئەگەر لـە تاقیکردنەوە سـەرکەوتووبووم، چ دیارییەکم بۆ دەکڕیت؟

باوکی بە دڵخۆشـییەوە وتی: ئەگەر نمرەی باشـت بەدەستهێنا، ئەوا بەڵێنت پێدەدەم، ئەم پشووە لەگەڵ خاڵۆت دەتنێرم بۆ گەشتێك، بۆ وڵاتی....!

سامی کوڕە گەورەی ماڵ بوو، دوای چاوەڕوانییەکی زۆر هاتبووە دنیا، لای دایكو باوکی کوڕێکی بەنازو خۆشەویست بوو، زۆر هەوڵیان دەدا بۆئەوەی بەختەوەری بکەن..

سامی ئەو شەوە لە خۆشی گەشتی دەرەوەی وڵات، خەو نەچووە چاوەکانی، بە درێژایی ئەو شەوە خەیاڵی بە خۆشیو بەسەربردنی کاتە خۆشەکانی ئەو گەشتەوە دەکرد..

بۆ ڕۆژی دواتر سامی بە هاوڕێیەتی باوکی، ڕۆیشت بۆ قوتابخانە بۆ وەرگرتنی نمرەی کۆتایـی سـاڵ.. باوکی لە نێو ئۆتۆمبێلەکـەدا چاوەڕێی دەکرد، دوای ماوەیەك سـامی بە هەڵەداوانو زۆر بە دڵخۆشییەوە گەڕایەوە نێو ئۆتۆمبێلەکەو کارتەکەی بە دەستەوە بوو، زۆر بە دڵخۆشـییەوە هاواری کرد، بابەگیان مژدەم بەرێ بە دووەم دەرچووم! باوکی زۆر

بە خۆشحاڵییەوە توند لە ئامێزی گرتو وتی: هەزار جار، یەك ملیۆن جار پیرۆزت بێت، کاکە سامی..

دوای چەنـد ڕۆژێك کاتی گەشـتەکەیان هاتە پێش، سـامی لـە فرۆکەخانە ماڵئاوایی لە دایەو بابە کردو بەرەو فرۆکەی گەشـتەکەیان کەوتە ڕێ، سامی یەکەمجاری بوو بچێتە نێو فرۆکەوە، ئەو جیهانێکی نوێی بینی، لە خۆشییەکدا بوو کە هەرگیز لەوەو پێش نەیبینیبوو..

هەموو ئەو شـتانەی دەیبینین بۆ سـامی تازەو نوێ بوو، زۆر شـتی نامۆو سـەیری چاوپێکەوت، ئەو بە هاوڕێیەتی خاڵی جیهانێکی نوێی بینی، ئەوەی زۆر لای سـەیر بوو، هەڵسـوکەوتی خاڵـۆی بوو، هەندێجـار دەیبینی زۆر پێدەکەنـێو هەندێجاریش ورێنەی دەکرد.. بەشێوەیەك کە سامی لە قسەکانی تێنەدەگەیشت..

لە کۆتاییدا سامی زانی کە خاڵی ئالودەی مەیخواردنەوە بووە، زۆرجار سامی لەبەرخۆیەوە دەیگوت: منیش وەکو خاڵم دەکەم، بۆئەوەی منیش وەکو ئەو هەست بە خۆشی بکەم..

دواجـار سـامی بۆ یەکەمجار، لەگـەڵ خاڵۆی دا، مەی خواردەوە، سـەرەتا حەزی لێی نەبوو، تەنها وەکو لاسـاییکردنەوەیەکی کوێرانە بۆ خاڵـی پاڵی پێوەنا کە تاقی بکاتەوە، ئیدی بۆ جاری دووەمو سێیەم شەرابی خواردەوە، تا وایلێهات بە خواردنەوەی مەی ئالودە بوو.. ئەو کات تەمەنی سامی سیانزە ساڵ بوو..

ماوەی پشوو گەشتەکەیان تەواو بوو، سامی لەگەڵ خاڵۆیدا گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، سامی دوای گەڕانەوەی هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوو کە چۆن مەی دەستبخاتو دووور لە چاوی دایكو باوکی بیخواتەوە، بەڵام دەسـتکەوتنی ئاسـان نەبوو، دوای کەمێك بیرکردنەوەو تێڕامان.. ژیرانە بڕیاری دا کە باشـترین ڕێگە چـارە ئەوەیە کە وازی لێبهێنێت، چونکە ئەو هێشـتا منداڵە، لەگەڵ ئەوەشـدا خواردنەوەی مەی حەرامەو خودای گەورە سزایەکی توندی بۆ بەکارهێنەرانی داناوە!

سـامی دوای ئـەو بڕیارەی گەڕایەوە سـەر ژیانی ئاسـایی خۆی، خواردنـەوەی مەی لە بیر کرد، سـێ سـاڵ تێپەڕی، بێئەوەی بیر لە خواردنەوەی مەی بکاتەوە، لە کۆتایی ساڵی چوارەمدا خێزانەکەی بڕیارياندا بۆ بەسـەربردنی پشـووی هاوین گەشت بکەن بۆ هەندەران بۆ یەکێك لە وڵاتە ئەوروپییەکان، هەر لەو گەشتەدا حەزی شاراوەی بۆ خواردنەوەی مەی سەریهەڵدایەوە، هەر بۆیە سامی لە هەلێك دەگەڕا، بۆئەوەی لە چاوی دایكو باوکی دووربکەوێتەوەو مەی بخواتەوە..

بۆ جاری دووەم سامی بە خواردنەوەی مەی ئالودە بوو، تا وایلێهات وەکو ئاو دەیخواردەوە..

شـــەوێكیان ســـامی لەگەڵ كوڕە خاڵەكەیدا ڕۆیشتن بۆ یانەیەكی شەوانە، پێكەوە دانیشتنو دەســـتیان بە خواردنەوەی مەی كرد.. دواتر بە مەســـتی گوێیان بۆ گۆرانیو مۆسیقا گرت.. لەو كاتانەدا كوڕەخاڵەكەی دەســـتیكرد بە گیرفانیداو شـــتێكی ڕەشی بچووكی دەرهێنا، بە هێواشی دەستی بە هەڵمژینی كرد، تا وایلێهات بە لای ڕاستو چەپدا دەكەوت..

سامی بە سەرسوڕمانەوە پرسی: ئەوە چییە؟ بۆچی وەها مەستی كردیت؟ كوڕەخاڵەكەی پێكەنیو وتی: نازانیت ئەوە چییە؟ ئەوە حەشیشەیە! ئەمە ئەوپەڕی تامو چێژی هەیە!

سامی وتی: ئایا ئەو پارچە بچووكە ئاوات لێدەكات؟ كوڕە خاڵەكەی وتی: فەرموو ئەو پارچەیە بگرەو تاقی بكەرەوە..

سامی پارچە حەشیشەكەی لێوەرگرتو هەڵی مژی، بە خەیاڵ چووە جیهانێكی دیكەوە..

ســـامی نەیدەزانی كە ئەو پارچە حەشیشـــەیە دەبێتە بۆسەیەك بۆی، نەیدەزانی ئەوە مردنێكـــە هەموو ڕۆژێك لە دەرگای دەدات، هەڕەشـــە لە ئاینـــدەی دەكات، دوای ماوەیەك سامی بووە كەسێكی ئالوودە بە ماددە هۆشبەرەكان.. ژیانی تەواو هەڵگەڕایەوە، تەندروستی بەرەو خراپی ڕۆیشت، بیروهۆشی تێكچوو، پارەو سامانی لە دەستدا نەما!

بەهەر جۆرێك بێت ســـامی خوێندنی تەواو كردو پیشەیەكی بەدەستهێنا، سەرەتا زۆر ڕقـــی لە خەڵكی دەوروبەریی بوو، حـــەزی دەكرد لێیان دووركەوێتەوە، ئەو وایدەزانی كە هەمـــوو خەڵكـــی بە نهێنی ژیانی ئەو دەزانن‌و هیچ كام لـــەوان متمانەیان پێی نەماوە، تا وای لێهات بووە كەسێكی زۆر توڕەو گۆشەگیر..

هەژدە ســـاڵ بەســـەر ئەو بارودۆخەدا تێپەڕی، لەگەڵ ئەوەشـــدا چەندین كاری گۆڕی بۆئـــەوەی بتوانێت خەرجی حەشیشـــەكەی بەدەســـتبهێنێت.. ڕۆژ لـــە دوای ڕۆژ گرفتو كێشەكانی زیادی دەكرد، تەنانەت لەگەڵ كەس‌و كارو خێزانەكەشیدا...

ســـامی وایدەزانی، ئەو لە دەریایەكی قوڵدایەو نە كەناری هەیەو نە ڕێگەی ڕزگاربوون.. هەربۆیە بڕیاری دا كە تەواوی كێشـــەكەی بۆ یەكێك لە هاوڕێ نزیكەكانی باس بكات، بەو هیوایـــەی ڕێگـــە چارەیەكی بۆ دابنێت.. تـــا لەو دۆزەخە ڕزگاری بكات.. بۆ ئەو مەبەســـتە ســـەردانی هاوڕێیەكی دێرینی كرد، هاوڕێكەی بە گەرمی پێشـــوازی لێكردو گلەیی لێكرد كە ماوەیەكی زۆرە دیار نییەو سەردانی نەكردووە!

ســـامی زۆر بـــە خەمباری تـــەواوی بەســـەرهاتو چیرۆكی ژیانی بۆ گێڕایـــەوە، داوای لێكرد یارمەتی بدات، تا لەو بارودۆخە ڕزگاری ببێت، كاتێك ســـامی لە قســـەكانی بووەوە،

هاوڕێکەی گوتی: چارەسەرێکم لایە تەواوی ئەو ئازارەت لەبیردەباتەوە، تەنها تۆ دەستت درێژ بکەو چاوەکانت بنوقێنەو کەمێك چاوەڕێ بکە..

سامی وتی: تۆ چی دەڵێی؟ من لە بارودۆخێکی زۆر خراپدام، کەی کاتی گاڵتەو گەپە!

هاوڕێکەی گوتی: من گاڵتە ناکەم، چیم پێ گوتی، وابکە، ئەنجامەکەی دەبینی!

سامی دەستی درێژ کردو چاوەکانی نوقاند، هاوڕێکەی دەستی گرتو دەرزییەکی لێدا.. کاتێك سامی چاوەکانی کردەوە، هاوڕێ ئامۆژگاریکارەکەی تەواو بوو لە لێدانی دەرزییەکەی، (هێرۆیین) بە تەواوی جەستەیدا بڵاوبووەوە!!

لەگەڵ سەرەتای لێدانی دەرزییەکەدا ئازاری نوێ تەواوی جەستەی سامی گرتەوە، ئیدی سامی ئالودەی هێرۆیین بوو، بە جۆرێك نەیدەتوانی دەستی لێ هەڵبگرێت، هەر کاتیش هەوڵی بدایە کە دەستی لێ هەڵبگرێت، هەستی بە ئازارێك دەکرد ئێسقانەکانی دەیان زریکاند، بە ئەندازەیەك کە توانای بەرگەگرتنی ئەو ئازارەی نەبوو!

سامی هەموو سەروەتو سامانەکەی بۆ کڕینی هێرۆیین خەرج کرد، قەرزێکی زۆری لە خانەوادەو هاوڕێکانی کرد.. (ئەوان ڕاستییەکەیان نەدەزانی)، تا کار گەیشتە ئەوەی خانووەکەشی خستە بارمتەوە.

دوای ماوەیەك تەندروستی زۆر خراپ بوو، چەند جارێك لە نەخۆشخانە خەوێنرا، بەڵام هیچ سودێکی نەبوو..

شەوێکیان نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگەی ئەو ئازارە سەختەی جەستەی بگرێت، کە پێویستی زۆری بە هێرۆیین بوو، بەڵام تەنها دینارێکی پێنەبوو بۆئەوەی ئەو ژەهرە کوشندەیە بکڕێت.. لەگەڵ ئەوەشدا بە هەرنرخێك بێت، دەبوا ئەو شەوە هێرۆینی دەستخستایە، ئەو شەوە باوکی لە سەفەر بوو..

سامی هەڵسوکەوتی گۆڕابوو بۆ کەسێکی شەڕانگێز، بەشێوەیەك کە بەهای مرۆیی خۆی لە دەستدا بوو، سامی بۆ دەستخستنی بڕێك هێرۆیین ڕووخساری خۆی پێچاو لە ژوورەکەی هاتەدەرەوە، بڕیاریدا ئاڵتونەکانی دایکی بدزێت، چونکە توانای ئارامگرتنی نەمابوو..

سامی بە هێواشی بەرەو ژوورەکەی دایکی ڕۆیشت، کانتۆرەکەی دایکی کردەوە، هەندێك لە ئاڵتونەکانی دایکی دزی، لەو کاتەدا دایکی لە دەنگی کانتۆرەکە وەخەبەرهات، بینی تارماییەك دەجوڵێت، بە هەموو هێزی هاواری کرد، حەرامزادە، حەرامزادە، ئەوە چی دەکەیت.. سامی بە دەستە پیسەکانی توند دەمی خاوێنو پاکی دایکی گرتو خستییە

سـەر زەوییەکە، دایکی لە ترسـا لە هۆشـی خۆی چوو.. لەو کاتەدا برا بچوکەکەی لە دەنگی دایکـی وەخەبەرهاتو بە هەڵەداوان بەرەو ژوورەکەی دایکی ڕۆیشـت، تارماییەکی بینی، پەلاماری داو بەشـەڕهاتن.. سـاتەکان بۆ سـامی زۆر سەخت بوون، هەڵوێسـتەکان گەلەك دژواربوون، نزیك بـوو دەرکەوێت کە ئەوە سـامییەو براکـەی گرتووەو دزی لە دایکی کردووە، سـامی بە چەقۆ لە برا بچوکەکەی دا، بۆئەوەی ڕابکاتو لەو بارودۆخەدا خۆی ڕزگار بکات.. پاشـان بە ئاڵتونەکانەوە ڕایکرد..

لـەو کاتەدا ئۆتۆمبێلی پۆلیس بە شـەقامەکەدا دەسـوڕایەوە، تێبینیان کرد کەسـێك لـەو ماڵە بە ڕاکـردن هاتەدەرەوە، دەکەوێت بە زەویداو هەڵدەسـتێتەوە، قوتویەکیشـی بەدەستەوەیە، گومانیان کرد کە ئەوە دزە، چواردەوریان گرتو دەستگیریان کرد..

کوڕە بچووکەکەیان گواسـتەوە بۆ نەخۆشـخانە، بەڵام بەداخـەوە لە ڕێگەدا گیانی لە دەستدا، بە هۆی ئەو چەقۆیەی کە نزیکترین کەسی لێیدا.. ئەو کەسەی کە پێکەوە نانیان دەخوارد، پێکەوە دەنوستنو پێکەوە پیدەکەنینو...

کاتێـك لێکۆڵینەوەکان ئەنجامدران ڕاسـتییەکی تاڵـی چاوەڕوان نەکراو سـەری هەڵدا، دەرکـەوت کـە تاوانبارەکە کە کەسـێکی کوشـتوەو ئاڵتونی ماڵەکەی دزیـوە، کوڕە گەورەی ماڵەکەیە (سامی)!

دایکی بەرگەی ئەو هەواڵەی نەگرت، نەخۆشـکەوتو بردیانە نەخۆشـخانە، هۆن هۆن فرمێسـکی دەباراند.. فرمێسکی پەشـیمانیو ئازارو خەم، بۆ کوڕە کوژراوەکەی، بۆ سامی ئالودەبوو، کە ئایندەی لە دەسـتدابوو، ئێسـتا لە دیدی خەڵکیدا سامی کەسێکی تاوانبارو بکوژو دزو پیاو خراپە!

سامی بۆ ڕابردووی خۆی زۆر گریا، ئەو بە هۆی ماددە هۆشبەرەکانەوە هەموو شتێکی لە دەسـتدا، دینو دونیای، پیشـەو فەرمانی، تەندروستیو خێزانو کەسو کاری، شۆرەتو ناوبانگی، تەنانەت بووە بکوژی براکەی!!

(سـامی)یان گواسـتەوە بۆ نەخۆشـخانە، بەردەوام بیری لە یادەوەرییە تاڵەکانی ڕابردووی دەکردەوە، کە ماددەی هۆشبەر هەموو ژیانی تێکدا..

خوێنەری ئازیز.. سامی ڕۆیشتو ناتوانێت ڕابردوی خۆی بگۆڕێت، بەڵام ئێمە دەتوانین لە ڕابردووی سامی پەند وەربگرینو هەرگیز نزیکی ئەو ڕێگەو هاوڕێو کەسانە نەکەوین، کە بە هەمان ئەنجامی سامیمان دەگەیەنن..






یەکێك لە خوێندکارە سەرکەوتووەکان، کە سەرکەوتووانە قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کردو بڕوانامەی زانکۆی بەدەستهێنا، ویستی پلەیەکی کارگێڕی لە کۆمپانیایەکی گەورەدا وەربگرێت..

لە پێش چاوپێکەوتنەکەدا، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە لە ڕێگەی ژیاننامەی ئەم خوێندکارەوە بۆی دەرکەوت کە ئەم کەسە خوێندکارێکی سەرکەوتوو بووەو تەواوی قۆناغەکانی خوێندنی بەوپەڕی لێهاتووییەوە بڕیوەو تا ئەو ساتەی زانکۆی تەواو کردووە، هیچساڵێك نمرەکانی لاواز نەبووە..

لە ساتی چاوپێکەوتندا، بەڕێوەبەر پرسیاری لە خوێندکارە لاوەکە کرد، ئایا لە ماوەی ساڵانی خوێندندا هیچ کات خۆت پارەی خوێندنەکەت داوە؟

لاوەکە وەڵامی دایەوە: هەرگیز..

بەڕێوەبەر پرسی: ئایا باوکت کرێی خوێندنەکەتی بۆ داویت؟

لاوەکە وەڵامی دایەوەو وتی: هێشتا تەمەنم تەنها یەك ساڵان بووە، باوکم کۆچی دوایی کردووە، تەواوی پارەو خەرجی خوێندنەکەم لە ئەستۆی دایکم بوو..

بەڕێوەبەر لێی پرسی: دایکت لە کوێ کار دەکات؟

لاوەکە وتی: دایکم جلی ماڵان دەشۆرێت!!

لەو کاتەدا بەڕێوەبەر داوای لە لاوەکە کرد، کە دەستەکانی نیشان بدات.. کاتێك سەیری دەستەکانی کرد، بینی دەستەکانی نەرمو ناسك بوو، بەوە نەدەچوو بۆ تەنها جارێك هاوکاری دایکی کردبێت..

بەڕێوەبەرەکە لێی پرسی: ئایا هیچ کات لە شۆردنی جلوبەرگدا هاوکاری دایکت کردووە؟

لاوەکە وتی: هەرگیز، دایکم هەمیشە داوای لێدەکردم کە سەرقاڵی خوێندنەکەم بم، چونکە دەیگوت من لەگەڵ جلشۆرین ڕاهاتووم و بەخێراییو لە کاتێکی کەمدا جلەکان دەشۆرم، تۆ کاتی خۆت بە جل شۆرینەوە بە فیڕۆ مەدە..

بەڕێوەبەرەکە پێی گوت: داواکارییەکی بچووکم هەیە، کاتێك گەڕایتەوە ماڵەوە، دەستەکانی دایکت بشۆرە، پاشان سبەینێ وەرەوە بۆ تەواوکردنی چاوپێکەوتنەکە..

لاوەکە هەستیکرد کە هەلی وەرگرتنی کارەکەی نزیکە، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە داوای لە دایکی کرد ڕێگەی بدات دەستەکانی بشۆرێت، چونکە ئەوە بەستراوەتەوە بە دەستکەوتنی ئەو کارەی کە لە مێژە خەونی پێوە دەبینێت.

دایکی بەو هەواڵە زۆر دڵخۆشبوو، بەڵام سەرسام بوو لە داواکاری ئەو بەڕێوەبەرە، نەیدەزانی بۆچی ئەو بەڕێوەبەرە ئەو داوایەی لێکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەستەکانی دایە دەست کوڕەکەی، تا داواکاری بەڕێوەبەرەکەی جێبەجێ بکات..

لاوەکە سەرەتا بە هێواشی دەستیکرد بە شۆرینی دەستەکانی دایکی، ئەوە یەکەمجار بوو، بە وردی سەیری دەستەکانی دایکی بکات، چەندە دەستەکانی چرچ بوون، دەستەکانی قڵیشاو زبر بووە، بەم دیمەنە هۆن هۆن ئەسرین بە چاوەکانیدا هاتنە خوارێ، ئەوە یەکەمجاربوو، کوڕەکەی ئەو دەستانە ببینێت، کە بە درێژایی ژیانی جلی شۆریوە، بۆئەوەی بتوانێت بژێوی ژیانیان دابین بکات!

هەموو ئەو زبرو قڵیشانەی لە دەستیدایە، ئەو نرخەیە کە داویەتی بۆ تەواوکردنی

قۆناغەکانی خوێندنم، بۆ گەیشتنم بە داهاتوویەکی ڕووناکو پرشنگدار..

دوای ئەوەی لە شۆرینی دەستی دایکی بووەوە، لاوەکە هەستا هەموو ئەو جلوبەرگانەی شۆرد، کە بڕیار بوو ئەو شەوە دایکی بیشوات..

بۆ ســبەینێ لاوەکە ڕۆیشتەوە بۆ لای بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە، لە کاتێکدا فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس مابوون..

بەڕێوەبەر لێی پرسی: دەکرێت هەواڵم پێ بدەیت کە چیت کردووەو دوێنێ لە ماڵەوە فێری چی بوویت؟

لاوەکە وەڵامی دایەوە: دەستەکانی دایکم شۆریو پاشان هەموو ئەو جوبەرگانەم شۆری کە لە ماڵەوە بوون..

بەڕێوەبەر پرســی: زۆر بە ڕاشــکاوانەو بە ئەمانەتەوە پێمبڵێ، هەستت بە چی کردو فێری چی بوویت؟

لاوەکە وتی: یەکەم: زۆر بە باشــی مانای بەخشــینم بۆ دەرکــەوت، ئەگەر دایکم ئەو هەموو قوربانیدانەی نەدایە، ئەوا هەرگیز نەمدەتوانی بەو ئاسانییە خوێندن تەواو بکەمو بڕوانامەی باڵا بەدەستبهێنم..

دووەم: هەستام بە ئەنجامدانی هەموو ئەو کارەی کە دایکم پێی هەڵدەستا، بەوەش زانیم کە ئەو لە پێناوی مندا چەند ماندوو بووە، چەندە دووچاری نارەحەتیو دەردەسەری بووە..

ســێیەم: گەورەییو نرخو بەهای ئەو مرۆڤەم بــۆ دەرکەوت، کە لە پێناوی ڕۆڵەکانیدا ئامادەیە هەموو قوربانییەك بدات..

لەو کاتەدا بەڕێوەبەر وتی: ئەوە ئەو بەڕێوەبەرەیە کە من بە شوێنیدا دەگەڕێم، تا ئەم کارەی پێببەخشــم، دەمەوێت مرۆڤێك بێت قەدری هاوکاری کەســانی دی بزانێت، چونکە ئەو جۆرە کەسانە هەموو ئامانجیان ماڵو سامان نابێت..

ئێستا پیرۆزت بێت، تۆ بوویتە کارمەندێکی ئەم کۆمپانیایە..

دوای ئــەو ڕۆژە، ئــەم لاوە بە گورجو گۆڵیو چالاکییەکــی نموونەییەوە، بە ڕێزگرتنو هاوکاری هەموو هاوکارانەوە کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد، سەرکەوتنێکی باشو ناوازەی لە کارەکانیدا بە دەستهێناوە..



# قوربانیدانی دایك، لە پێناو جگەرگۆشەكانیدا..

دایكی چوار منداڵ بووم، لە پێناوی منداڵەكانمدا تاڵو سوێری زۆرم چەشت، ساڵانێكی زۆر ستەمو زۆرداری هاوسەرەكەم قبوڵ كرد، لەسەر هەموو ئازارو سوكایەتیو قسەی ناشیرینی هاوسەرەكەم ئارامم گرت، كە جگە لە ساڵی یەكەمی هاوسەریمان، قسەی خۆشم لێنەبیستووە، سەرەڕای ئەوەش ژنی دووەمی هێنا، ئەو كات ناڕەحەتییەكان ئەوەندەی تر زیادیان كرد، ئیدی بە تەواوی منو منداڵەكانمی فەرامۆش كرد، بە قسەو بە كردەوە ئازاری دەداین، دوای ئەوەی خێزانی دووەمی منداڵی بوو، جیاوازی زۆری دەكرد لەگەڵ منداڵەكانی منو ئەودا، سۆزو نازو خۆشەویستی بۆ خێزانی دووەمو منداڵەكانی، سزاو قسەی ناخۆشیش بۆ منو منداڵەكانم..

سەرەڕای ئەوەش لەسەر ئەو بارودۆخە ئارامم گرت، تەنانەت سكاڵای خۆم لای هیچ كەس نەدركاند، چەند ساڵێك تێپەڕی، تەنها كەسێك كە بە كاروباری نێوماڵو منداڵەكانم هەڵسێت خۆم بووم، منداڵەكانم لە سۆزی باوكایەتی، لە جلوبەرگی تازەوجوان، لە گەشتو سەیران، هەموو ئەوانە بێبەشبوون..

دەردەسەریو ناڕەحەتییەكانم زۆربوون، ڕۆژێكیان پسووڵەی كارەبا هاتەوە، پارەی زۆرمان بۆ هاتبووەوە، چونكە هەردوو نهۆمەكە یەك كاژێری هەبوو، لە بیرم دێت نیوەڕۆیەكی گەرمی

هاوین بوو، هاوسەرەکەم هاتە ژوورەوە، کە پسوڵەی کارەباکەی بینی، ئامێری فێنککەرەوەکەی کوژاندەوەو کۆڵێك قسەی پێ وتین، لە کاتێکدا لە ماڵی ئێمە تەنها یەك ئامێری فێنککەرەوە هەبوو، بەڵام خۆی لە گەڵ خاتوونی دووەم کە لە نهۆمی دووەمدا بوون، هەر منداڵێکی لە ژوورێکی تایبەتدا بوونو هەر یەکەیان ئامێری تایبەتی فێنککەرەوەیان هەبوو..

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، خێزانی دووەمی هانی دەدا کە واز لە من بهێنێتو تەڵاقم بدات، بۆئەوەی تەنها خۆیو منداڵەکانی لە نێو خانووەکەدا بمێننەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەهانەی زیاتری پێدەگرتم، بەڵام من هەر ئارامم دەگرت، تا ئەو ڕۆژەی کە لێی دەترسام هاتەپێشو هاوسەرە ستەمکارەکەم هات بۆلامو وتی: من پێویستم بە تۆ نییە، ئەوا تۆم تەڵاقدا!! لەماڵ کردینیە دەرەوە!!

کوڕەگەورەکەم ناچاربوو، واز لە خوێندن بهێنێو دەست بە کارکردن بکات، بۆئەوەی بتوانێت خەرجی خوشكو براکانی دابین بکات.. کەس نازانێت خێر لە چیدایە، ئەو ساتەی گوێم لە وشەی تەڵاق بوو، هەموو دنیام لەبەرچاو ڕەش بوو، زۆر نیگەران بووم، فرمێسکی زۆرم هەڵوەراند، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم خەمەکانمان گۆڕا بە خۆشیو شادی، بەتایبەت سوپاس بۆ خودا کە کوڕە گەورەکەم دەیتوانی خەرجی ڕۆژانەمان بۆ دابین بکات، ئیدی کەس نەبوو، ئازارمان بداتو قسەی ناخۆشمان پێ بڵێو سوکایەتیمان پێ بکاتو منەت بکات بەسەرماندا..

چەند ساڵێك بەو شێوەیە لەگەڵ منداڵەکانم ژیانمان گوزەراند، سوپاس بۆ خودا لە کۆتاییدا جگە لە کوڕە گەورەکەم ئەوانی دی خوێندنیان تەواو کرد، دووەمیان بووە ئەندازیارو سێیەم بە مامۆستاو چوارەمیش بە پزیشك..

کوڕەگەورەکەشم لەگەڵ کچێکی سەنگینو جوانو خاوەن ئاکاری بەرز، هاوسەرگیری کرد، خێزانەکەی بۆ من بووە کچێکی زۆر دڵسۆز، بە وێنەی دایکی خۆشی دەویستم، بۆ کوڕەکەشم خێزانێکی زۆر باشبوو..

ساڵەکان وەکو مانگ تێپەڕدەبوون، کاتەکانی خۆشیو ئاسوودەیی زۆر خێرا بەسەرتدا گوزەر دەکەن، ئیدی منیش بەساڵاچوومو نەخۆشی تەنگی پێ هەڵچنیم، تا واملێهات کە نەمدەتوانی بە تەنها ڕێگە بکەم، کوڕەکانم هەموو ڕێگەیەکیان گرتە بەر، چ لە ناوخۆی وڵات، چ لە دەرەوەی وڵات، بەڵام بەداخەوە چارەسەرێك بەدی نەدەکرا.

کوڕەکانم بۆ ساتێکیش جێیان نەدەهێشتم، هەر شتێکم داوا بکردایە بۆیان ئامادە دەکرم، بەردەوام ماچیان دەکردمو نازیان پێدەبەخشیم، بە دەستی خۆیان نانیان دەکرد بە دەممەوە، هەرگیز نەدەخەوتن تا ئەو کاتەی دڵنیادەبوون کە من خەوم لێکەوتوە، پاشان ئەوان دەخەوتن..

لەو دەمانەدا بوو، خوای گەورە نەوەیەکی پێبەخشیم، کوڕە گەورەکەم لە خۆشەویستی من هەمان ناوی منی لێنا، هەرچەندە تەندروستیم باش نەبوو، بەڵام بە بینینی نەوەکەم زۆر دڵخۆشبووم، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئازار زیاتر تەنگی پێ هەڵدەچنیم، کوڕەکانم بە بینینی من بەو حاڵەوە زۆر نیگەران بوون، ئەوان جگە لە پاڕانەوە لە بارەگای خودا دەسەڵاتێکی دیکەیان نەبوو..

ڕۆژێکیان هەموو کوڕەکانم بانگ کردو پێم گوتن: (کوڕەکانم دەمەوێت شتێکتان پێ بڵێم: بڕۆن سەردانی باوکتان بکەن، هەتا دەتوانن چاکەی لەگەڵدا بکەن، ئەو هەر چییەکی کردبێت لە بیرتان نەچێت، باوکتانەو مافی بەسەرتانەوە هەیە!).

سەرنج لەو دایکە میهرەبانە بدە، لەو دڵە گەورەو پاکە، سەرەڕای ئەو هەموو نارەحەتییە، ئەو هەموو خراپەی دەرهەق بە خۆیو کوڕەکانی کراوە، ئێستا ئامۆژگاری کوڕەکانی دەکات، کە لەگەڵ باوکیاندا چاك بنو ڕەفتاری جوان بنوێنن..

دوا وتەو ئامۆژگاری بۆ منداڵەکانی نووسی: (بۆ کوڕە خۆشەویستەکانم، ئێوە سۆمای ئەوینو بەرهەمی جەرگمن، من لە ناخەوە پێتان دەڵێم: کە لە ئێوە ڕازیم، لە خودای گەورەش داواکارم لە ئێوە ڕازی بێت.. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە هەموومان پێکەوە لە بەهەشتی بەرینی خۆی کۆبکاتەوە، خودای گەورە خێزانو منداڵ گەلێکتان پێببەخشێت، کە ببنە هۆی بەختەوەریو چاوڕوونیتان لە دنیاو دواڕۆژدا، چاکەکاربن لەگەڵتاندا، هەروەکو ئەوەی ئێوە لەگەڵ من چاکبوون.. بەڵام بە نیسبەت هاوسەرەکەمەوە، من هەرگیز لێی نابورم، دەیسپێرم بەو خودایەی کە هیچ شتێکی لێ ون نابێت.. لە کۆتاییدا دەڵێم: (حسبنا‌الله ونعم الوکیل)..

دواجار بۆ هەمیشە ئەم دایکە میهرەبانە ماڵاوایی کردو دنیای بەجێهێشت، کوڕەکانیشی هەروەکو چۆن لەو کاتەی لە ژیاندا بوو، خزمەتیان دەکرد، بە هەمان شێوە لە پاش مردنی نزایان بۆ دەکردو حەجیان بۆ کردو بەردەوام خێرو چاکەیان بۆ دەکرد..

بەڵام هەموو ئەوانەی ئەم کوڕانە بۆ دایکیان ئەنجامیان دەدا، نەدەگەیشتە ئەوەی کە ئەو دایکە بۆ ئەوانی ئەنجامداوە..




# دەتوانین یەکترمان خۆشبووێت؟

ژنو مێردێکی بەساڵاچوو، کە تەنها خاوەنی یەك کوڕ بوون، ئەویش سەرباز بوو، ماوەیەکی زۆر بوو پەرۆشی بیستنی هەواڵی کوڕە تاقانەکەیان بوون، لە مێژبوو چاوەڕوانیان دەکرد کەسێك لە دەرگا بداو ئەمانیش بە هەڵەداوان بڕۆن دەرگاکەی لێ بکەنەوەو بە توندی لە ئامێزی بگرن، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ساتێك بەردەوام چاوەکانیان لەسەر ئامێری تەلەفۆنەکە بوو، چاوەڕێیان دەکرد هیچنا کوڕەکەیان تەلەفۆنێکیان بۆ بکاتو گوێبیستی هەواڵو بارودۆخی بن، ئەو بەیانییە بە زەنگی تەلەفۆنەکە بەخەبەر هاتن، پێشبڕکێیان کرد بۆ وەڵامدانەوەی، پیرە پیاو خۆی گەیاندە تەلەفۆنەکەو ئەلو.. ئەلوو.. کێ قسە دەکات؟ وەڵامی دایەوە، بابە گیان من (کلارك)م، حاڵتان چۆنە؟

پیرەپیاو بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە: دەبێت لە دووری تۆ حاڵمان چۆن بێت؟! تۆ چۆنی کوڕە شیرینەکەم؟ کەی دەگەڕێیتەوە بۆ لامان؟ دایکیشی ئۆقرەی نەگرت تا کوڕەکەی وەڵام بداتەوە، بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە وتی: تاقانەکەم حاڵی تۆچۆنە؟ سەلامەتی؟

(کلارک): بەڵێ، دایەگیان من زۆرباشم، بە پشتیوانی خودا چەند ڕۆژێکی تر بە نیازم بگەڕێمەوە..

بە بیستنی ئەم هەواڵە ئەوەندە دڵخۆشبوون، کە وێنا ناکرێت، باوکی وتی: کوڕم بە ڕاستی دەگەڕێیتەوە بۆ لامان، منو دایکت زۆر پەرۆشی بینینی چاوەکانی تۆین، لە دووری تۆ ئاراممان لێبڕاوە!

کلارک: لە ڕاستیدا ئێستا کێشەیەکم بۆ هاتۆتە پێش، بۆیە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆلاتان، هاوڕێیەکی زۆر ئەزیزم لە شەڕەکەدا هەردوو دەستیو قاچی ڕاستی لە دەستداوە، زۆر بە نارەحەتی دەتوانێت بجووڵێتو قسە بکات، ئایا دەتوانم لەگەڵ خۆمدا بیهێنمەوە بۆ ماڵەوە؟

باوکی وتی: لەگەڵ خۆتدا بیهێنیتەوە؟

بەڵێ، چونکە من ناتوانم جێیبهێڵم، ئەویش نایەوێت بەو شێوەیە بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکارەکەی، بەو حاڵەوە توانای بینینی ئەوانی نییە، بەردەوام دەپرسێت ئاخۆ کەسوکارم منیان بەو حاڵەوە قبوڵە، یا نا؟

باوک: کوڕی شیرینم، تۆ چیت لەو دەردەسەرییە داوە، وازی لێبێنە، با نەخۆشخانە خۆیان سەرپەرشتی بکەن، چونکە ئەگەر تۆ لەگەڵ خۆشتدا بیهێنیتەوە، کێ دەتوانێت وەها کەسێك خزمەت بکات؟ کێ ئامادەیە لەگەڵ کەسێکدا ژیان بگوزەرێنێت کە هەردوو دەستیو قاچێکیشی نەبێت؟ کوڕم، گوێت لێمە؟ لەسەر هێڵ ماویت؟ بۆ وەڵام نادەیتەوە؟

کلارك: بابەگیان گوێم لێتە، ئایا ئەوە دوابڕیارتە؟

بەڵێ، کوڕە ئەزیزەکەم، پەیوەندی بکە بە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەیەوە، بۆئەوەی بێن بە دەم کوڕەکەیانەوەو بیدەرەوە دەستی کەسوکارەکەی؟

کلارك: لەو باوەڕەدایت هیچ کام لە ئەندامانی خێزانەکەی ئەم کوڕە بەو حاڵەوە قبوڵ بکەن؟

باوك: لەو باوەڕەدا نیم، هیچ کەس لە ئەوان بتوانێت ئەو بەرپرسیارێتییە سەختە بخاتە ئەستۆی خۆی!

کلارك: زۆرباشە بابەگیان، ئێستا کاتی ماڵئاواییە، خۆشحاڵ بووم گوێم لە دەنگتان بوو، بە هیوای دیدارتان! خواتان لەگەڵ!

دوای تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بەسەر ئەم گفتوگۆ تەلەفۆنییەدا، سەربازەکان تەرمی (کلارك)یان، لە ناو ڕووبارەکەدا دۆزییەوە، دوای ئەوەی توانیبووی لە نەخۆشخانەی سەربازی ڕابکات، لەسەر یەکێك لە پردەکانەوە خۆی هەڵدابووە نێو ئاوەکەو کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنابوو..

بۆ جاری دووەم زەنگی تەلەفۆنەکە دوای دوو ڕۆژ لێدرا، بەڵام ئەمجارەیان کلارك نەبوو، بەڵکو بانگهێشتی باوکی کلارك کرا تا بچێت تەرمی کوڕەکەی وەربگرێتەوە، کاتێك تەرمی کوڕەکەی بینی تووشی شۆك بوو، چونکە کلارك هەر دوو دەستیو قاچی ڕاستی نەبوو، باوکی تێگەیشت ئەو کەسەی کلارك باسی دەکرد هاوڕێی کلارك نەبوو، بەڵکو کلارك خۆی بوو، هەردوو دەستو قاچی ڕاستی لە دەست داوە! ویستوویەتی هەڵوێستی دایكوباوکی سەبارەت بە وەها کەسێك بزانێت، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ناویان!

چیرۆکی ئەم باوکە لە ژیانی زۆرێك لە ئێمە دەچێت، چونکە ئێمە کەسانی دەوروبەرمان لەبەر خۆیان خۆشناوێت، بەڵکو لەبەرئەوەی شۆخو شەنگن، یان شێوەو باڵاو ڕووخساریان جوانە، لەبەرئەوە هەرگیز ناتوانین (کەسە ناتەواوەکانمان خۆشبووێت) جا ئەو ناتەواوییە لە شێوەو ڕووخساردا بێت، یان لە سروشتو نەریتو هەڵسوکەوتیاندا بێت.

هەر بۆیە پێویستە ئەوە بزانین کە هەر کات باسی کەسێکی کەمئەندام، یان ناتەواو لە شێوەو ڕووخسارو هەڵسووکەوتدا کرا، دەبێت هەمیشە خۆمان بێتەوە یاد لەسەر ئەو حاڵەتە، واتە ئەگەر تۆ ئەو ڕووداوە، یا کارەساتەت بەسەردا بێت، حەزدەکەیت کەسوکارو دۆستانت چۆن مامەڵەت لەگەڵدا بکەن؟

با هەمووان ئەم فەرمودەیە بکەینە سەرمەشقی ژیانمان:

(ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە، پێویستە بۆ کەسانی دەوروبەریشت پێخۆش بێت)!

# کێ دایکم لێدەکڕێت؟

لە شەوی زەماوەندیی هاوسەرگیریدا کاکی زاوا لە تەنیشتی بووکەخانەوە دانیشتبوو، بە دڵێکی خۆشو ئاسوودەو لەوپەڕی خۆشحاڵیداو بە زەردەخەنەوە بۆ بووکەخانی دەڕوانی، ڕەنگە سەیر نەبێت کاتێك دەبینیت زاوا لەوپەڕی خۆشحاڵیدایە، چونکە ئەمڕۆژە خەونی لە مێژینەیەتیو دیاریکردنی داهاتوویەتیو ئەو ساتەوەختەیە کە لە مێژە خەونی پێوە دەبینێت، ئێستا خەوەکەی هاتووەتە دیو گەیشتووە بەو کەسەی ئاواتەخواز بوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژێرسێبەری ماڵێکی خنجیلانەدا کۆببنەوە..

ڕوانینەکان لە ناخی دڵەوە بوو، زەردەخەنەو پێکەنینەکان ڕاستەقینەبوون، بەختەوەریو خۆشحاڵی ئەو ڕۆژەیان پڕکردبوو، بەشێوەیەك ڕەنگە نەتوانرێت بە ئاسانی وێنابکرێت، دایەو دۆستانو ئەزیزان بە خۆشحاڵییەکانی ئەوان زۆر خۆشحاڵبوون، ئیدی بەختەوەری هەموو لایەکی هۆڵەکەی تەنیبوو، خەم لە هیچ سوچو قوژبنێکی ئەو شوێنەدا جێگەیەکی شك نەدەبرد، تیایدا دابنیشێت!

دایکی زاوا.. کە زۆر لە مێژبوو ئاواتی ئەوەبوو لە زەماوەندی کوڕە تاقانەکەیدا بەشداری بکات، هەربۆیە ئەو ڕۆژە لە هەمووان زیاتر دڵخۆشبوو، چاوەکانی بڕیبووە ڕووخساری جوانی کوڕە شیرینەکەیو نقومی خەیاڵاتی خۆشی ببوو، نەیدەزانی لە خۆشیدا بگری، یاخود پێبکەنێت؟!!

کاتێکیش دەیبینی کوڕەکەی زۆر دڵخۆشە، ئەوەندەی تر شادمان دەبوو.. بەڵام بەداخەوە ئەوەی نەدەبوو ڕوویدات ڕووی دا، لە ناکاو خەم جێگەی خۆشیو شادی گرتەوە، گریان شوێنی خەندەی

گرتەوە، خۆشحاڵی ئامادەبووان گۆڕا بۆ خەمو پەژارەیەك كە ئاستەم بوو چارەسەركردنی..

دەزانـــی كێ هۆكاربـــوو؟ بووكەخان، بـــە زەردەخەنـــەو خۆشـــحاڵییەكانی دایكی زاوا، خۆشـــحاڵ نەبوو، ئەو بە تێڕوانینێكی دوژمنكارانەوە لە خەسووی دەڕوانی، هەربۆیە ئەو خۆشحاڵییەی زاوای بە دەرفەت زانیو بە گوێی زاوادا چپاندیو وتی: دەبێت دایكت لەسەر منەصەكە دابەزێنیتو بچێتە خوارەوە!!!

زاوا بە بیستنی ئەم وتەیە زۆر نیگەران بوو، لە دڵی خۆیدا ئەم وتەیەی چەند جارێك دووبارە كردەوە، بیری دەكردەوە چی بكات لە دایكی، بۆئەوەی دڵی بووكەخان ڕازی بكات؟!

لە ناكاوو لە هەڵوێســـتێكی چاوەڕوان نەكراودا، هەســـتایە سەرپێو مایكرۆفۆنەكەی بە دەستەوە گرتو بە دەنگێكی بەرز وتی: (كێ دایكم لێدەكڕێت؟!)

ئەم وتەیەی ســـێ جار دووبارە كردەوە، تەواوی ئامادەبووان بە بیســـتنی ئەم قســـەیە سەرســـام ببوون، بەڵام نەیاندەزانی چی ڕوودەدات، ئەم قســـانەو لەم كاتەدا بۆ؟ هەمووان لەبەرخۆیانەوە دەیانگوت: چۆن لە یەكەم شەوی هاوسەرگیریدا زاوا دایكی دەفرۆشێت؟

ئەوان لە بێ وەفایی كاكی زاوا زۆر پەستو نیگەران بوون، ساڵانێك بوو ئەم دایكە داماوە چاوەڕێی ئەمڕۆژەی دەكرد، ئێستاش لەبری پاداشت لە زەماوەندەكەیدا دایكی هەڕاج دەكات!!

بەڵام هیچ كەس نەبوو، وەڵامی كاكی زاوا بداتەوە؟

كاتێك هیچ كەس وەڵامی نەدایەوە: زاوا وتی: كەواتە خۆم دایكم دەكڕم!

سەیرێكی بووكەخانی كردو لە بەردەمی ئامادەبوواندا بە توڕەییەوە وتی: تۆم تەڵاقداو بۆ هەمیشە لە یەكدی جیابووینەوە!

ئیـــدی دەســـتی دایكی گرتو لە هۆڵەكـــە چوونە دەرەوە، ئەم هەواڵـــە بەناو هەموو ئامادەبووانـــدا بڵاوبووەوە، یەكێك لە ئامادەبووان كـــە زانی كوڕەكە لەبەرخاتری دایكی ئەو كارەی كردووە، ڕۆیشت بە دوایانداو بانگی كوڕەكەی كردو پێی وت: تۆ پیاوی كوڕی پیاوی، خاوەنی هەڵوێســـتێكی جوامێرانەی، ئەوا بڕیارمدا كچەكەی خۆمت پێببەخشم، بەو مەرجەی هەردووكتان بە یەكدی ڕازی بن!

زۆر ڕاســـتە كە هەر كەس لەبەر خاتری خودا واز لە شتێك بهێنێت، خوای گەورە زۆر لەوە باشتری پێدەبەخشێت!

پەندێكی كوردیم وەبیرهاتەوە، كە دەڵێت: زۆرجار بووك لەسەر ئەسپ دەگەڕێتەوە!

ئەم ڕووداوە خەیاڵو دروستكراو نییە، بەڵكو چیرۆكێكی ڕاستەقینەیە!



# هەرگیز هاوسەرگیری مەکە!

هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..

پێش ئەوەی زۆر بە وردی لە ماناو مەبەستی هاوسەرگیری تێدەگەیت!

هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..

تـا ئەو کاتەی فێری مافەکانی هاوســەرەکەت دەبیت، پێش ئــەوەی فێری پلەو پایەی هاوسەرەکەتو مافەکانی بەسەرتەوە دەبیت!

هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..

پێش ئەوەی فێردەبیت چۆن ژیانێك پڕ لە خۆشــی بۆ خۆتو هاوســەرەکەت فەراهەم دەهێنیت!

هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..

تا ئەو کاتەی فێردەبیت کە چۆن منداڵ پەروەردە دەکەیت، تا ببنە کەسانی بەسوود بۆ خۆیانو دەوروبەرو دونیاو دوارۆژیان.

**هەرگیز هاوسەرگیری مەکە:**

ئەگەر وادەزانیت ژیانی هاوسەری بریتییە لە چیرۆکی خۆشەویستی پڕ عیشقو ئەوین، ئەگەر وادەزانیت ژیانی هاوســەری وەکو ژیانی ئەو هاوســەرانە وایە کە لە دراماو زنجیرە فیلمەکاندا پێشکەش دەکرێت، ژیانی هاوسەری ڕاستەقینەیە، خەونو خەیاڵ نییە، هەموو ڕۆژێك شــادیو خۆشی نییە، ژیانی هاوســەری بریتییە لە خۆشیو ناخۆشیو ئارامگرتنو سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر کێشەو گرفتەکانی ڕۆژانەدا..

**هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..**

ئەگەر وادەزانیت ژیانی هاوســەری تاقیکردنەوەیەو هەر کات ویســتت بە ئاســانی لێی دێیتــە دەرەوە، یــان بــە هەر هۆکارێکی لاوەکی لــە یەکتر جیا دەبنــەوەو هەر یەکەتان دەگەڕێتەوە بۆ ســەر ژیانو گوزەرانی پێشووی، هاوسەرگیری (بریتییە لە پەیوەندییەکی پتەوو دامەزراوو نەپچڕاوو بەردەوام)، ژیانێکی تەواو جیاواز لە ژیانی ڕابردووت، مامەڵەو هەڵسوکەوتو ڕێکخستنی گوزەرانو ژیانو ڕێساو یاسای تایبەتی دەوێت..

**هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..**

ئەگەر وادەزانیت ژیانی هاوســەری وەکو ســەردەمی دەزگیرانــی وایە، هەموو ڕۆژێك پێکەوە لە ڕێستورانتێك دادەنیشنو بەدەم گۆڕینەوەی عیشقو ئەوینەوە بە چەند کاژێرێك نانخواردنەکەتــان تەواو دەکــەن.. یاخود هەموو ئێوارەیەك تا خۆرئاوابوون لە نێو پارکو شەقامو شــوێنە گەشــتیارییەکان، پیاســەدەکەنو ئەو ڕۆژەتان بە کاتژمێرێك لێدەڕوات، ژیانی هاوســەری بریتییە لە بەرپرسیارێتیو خواردن ئامادەکردنو ماڵداریو میوانداریو پاکو خاوێنیو ڕاگرتنی دڵی یەکترو ڕێزگرتن لە کەسو کاری یەکترو... هتد.

**هەرگیز هاوسەرگیری مەکە..**

گەر وادەزانیت هەموو ڕۆرژێکتان بە عیشــقو شــادیو کامەرانی بەڕێوەدەچێت، ڕاستە عیشقی ڕاستەقینە لە دوای هاوسەرگیری دروست دەبێت، بەڵام هاوسەرگیری وەکو ڕێگەیەك وایە کە هەورازو نشــێوو تاســەو لۆفەو پێچاوپێچی تێدایە، لە هەمان کاتدا زۆربەی زۆری ڕێگەکە تەختو ڤیرتاوو بێ کێشەیە!!

به هیوای ژیانێکی ئاسوودە بۆ سەرجەم هاوسەران..





# ئەو ئافرەتەی هاوسەرەکەی شەرمی لێدەکات!

ئەمە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیەو بەڕێز (دکتور خالد جبیر) پسپۆری نەشتەرگەری دڵو سییەکان.. بەمشێوەیە چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان نەشتەرگەرییەکم ئەنجام دا، بۆ منداڵێك کە تەمەنی تەنها دووساڵو نیو بوو..

ڕۆژی نەشــتەرگەرییەکە سێ شــەممە بوو، بۆ ڕۆژی چوار شەممە منداڵەکە تەندروستی زۆر باشبوو، بەڵام ڕۆژی پێنج شەممە کاتژمێر (١١:١٥) کە هەرگیز ئەو ساتەم بیرناچێتەوە.. یەکێــك لــە برینپێچەکان هەواڵی پێدام کە دڵی منداڵەکە وەســتاوەو هەناســە نادات، زۆر بەخێرایی ڕۆیشــتم بۆ لای منداڵەکەو ماوەی (٤٥) خولەك کاری شــێلانی دڵم بۆ کرد، لەو ماوەیەدا دڵی نەکەوتەوە کار، دواتر سوپاس بۆ خودا دڵی کەوتەوە کار، پاشان منیش چوومە دەرەوە تــا کــەس‌وکاری لە بارودۆخی منداڵەکە ئاگادار بکەمــەوە، هەروەکو دەزانن چەندە ســەختە کە هەواڵ بە کەس‌وکاری نەخۆشەکە بدەیت، لە کاتێکدا بارودۆخی نەخۆشەکەیان خراپە! ئەوە ناخۆشــترینو قورســترین کاری پزیشــکە، بەڵام چارەیەك نییەو پێویســتە کەس‌وکاری ڕاستییەکان بزانن..

پرسیارم لە باوکی منداڵەکە کرد، دیاربوو لەوێ نەبوو، دایکی وەڵامی دایەوە، پێم گوت: کــە هۆکاری لــە کارکەوتنی دڵی منداڵەکەت لە ئەنجامی خوێنبەربوون بووە لە قوڕگیدا.. هۆکاری خوێنبەربوونەکە نازانم، بەڵام منداڵەکە ژیانی لە مەترسیدایە..

لــەو بــاوەڕەدان ئەم دایکە چی بڵێــت؟ ئایا هاواری کرد؟ قیژاندی؟ یــان وتی: تاوانی تۆبووە نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو نەبووە؟

بڕواتان هەبێت، هیچ شــتێك لەوانەی نەگوت، تەنها وتی: (ســوپاس بۆ خوای گەورە)، ئەمەی گوتو ڕۆیشت!! دوای (١٠) ڕۆژ.. سوپاس بۆ خودا منداڵەکە دەستیکردەوە بە جوڵە، دەرکەوت کە مۆخی منداڵەکە ســەلامەتو تەندروستە.. بەڵام پاش (١٢) ڕۆژی تر، جارێکی تــر دڵــی منداڵەکە لەکارکەوت، بــە هەمان هۆکاری ئەو خوێنبەربوونــە، دووبارە بۆ ماوەی (٤٥) خولەك شــێلانی دڵمان بۆ ئەنجامدا، بەڵام دڵی نەکەوتەوە کار، ئەمجارەیان بە دایکیم وت: ببورە لەو بڕوایەدام کە هیچ هیوایەکمان نەماوە.. دەزانن بە بیســتنی ئەم هەواڵە چی گوت؟ وتی: (خودایە ســوپاس بۆ تۆ، خوایەگیان ئەگەر خێر لەوەدایە کە شــیفای بۆ بنێری، پەروەدگارا شیفای بدە)!

پاش ماوەیەك دڵی کەوتەوە کار، نزیکەی (٦) جار ئەم حاڵەتە دووبارە بووەوە.. سەرەنجام پزیشــکێکی پســپۆڕ لە بواری بۆری هەوادا، بە ویســتی خودا توانــی خوێنبەربوونەکەی بووەســتێنێت.. سێ مانگو نیو بەسەر نەشتەرگەرییەکەیدا تێپەڕی، بەڵام هەر لە ژووری بوژانەوەی دڵو لە حاڵەتی بێهۆشیدایەو ناجوڵێتەوە..

پــاش ئــەو ماوەیە دەســتیکرد بە جوڵە، بــەڵام دوومەڵێکی گەورەو نامۆ لە ســەریدا دەرکەوت، کە هەرگیز پێشتر دوومەڵی لەو شێوەیەم نەدیبوو..

ئەمجارەشیان بە دایکیمان گوت: منداڵەکەت پێناچێت زیندوو بمێنێت، ژیانی ئاستەمە.. ئەگەر چەندجار ڕزگاری بوو لە وەستانی دڵی، بەڵام لەم دوومەڵە ڕزگاری نابێت، دووبارە وتی: (سوپاس بۆ خودا)، ئەوەی وتو ڕۆیشتەوە بۆ لای منداڵەکەی.

دوای ئەوە دەســتبەجێ منداڵەکەمان گواستەوە بۆ لای پزیشکی پسپۆڕی مێشكو دەمار، بۆئــەوەی سەرپەرشــتی تەندروســتی بکات.. دوای ســێ هەفتە بە فەزڵی خــودای گەورە، منداڵەکە لەو دوومەڵە ڕزگاری بوو، بە تەواوی چاکبووەوە، بەڵام هەر نەدەجوڵایەوە، دوای

دوو هەفتەی تر، دووچاری ژەهراویبوونێکی سەیر بوو لە خوێنیدا، پلەی گەرمی گەیشتە ٤١،٢ پلەی سەدی..

بە دایکیم گوت: مێشکی منداڵەکەت لە مەترسییەکی گەورەدایە، هیچ هیوایەکمان بۆ ڕزگارکردنی نییە، دووبارە زۆر بە ئارامییەوە وتی: (خودایە ئەگەر لە شیفادانی دا خێر هەیە، شیفای بۆ بنێرە)..

دوای ئەوەی ئەم هەواڵەم بە دایکی منداڵەکە ڕاگەیاند، کە لەسەر قەرەوێڵەی ژمارە (٥) کەوتبوو، ڕۆیشتم بۆ چاودێرکردنی نەخۆشی ژمارە (٦)، سەیر دەکەم دایکی نەخۆشەکە دەگری‌و هاوار دەکات‌و دەڵێت: دکتور، دکتور.. فریام کەوە دکتور گیان، پلەی گەرمی منداڵەکەم ٣٧،٦، پلەکەی زۆر بەرزە، منداڵەکەم دەمرێت..

منیش زۆر بەسەرسوڕمانەوە پێمگوت: سەیرێکی دایکی ئەو منداڵە بکە، کە لەسەر قەرەوێڵەی ژمارە (٥).. پلەی گەرمی منداڵەکەی لە سەرو (٤١) پلەوەیە، بەردەوام سوپاسی خودا دەکات‌و ئارامی گرتووە!!

لە وەڵامدا وتی: دایکی ئەو منداڵە نەهەستی هەیەو نەسۆز!! بیری ئەم فەرموودەیەم کەوتەوە: (طوبى للغرباء)، تەنها دوو وشەیە، بەڵام ئەم دوو وشەیە ئوممەتێك دێنێتە لەرزە.. لە ماوەی ٢٣ ساڵی کارکردنمدا لە نەخۆشخانەکان، تەنها دوو کەسم بینیوە بەرامبەر قەدەری خودا بە وێنەی ئەو خوشکە ئارامگرو سوپاسگوزارو ڕەزامەند بێت!

هێشتا چیرۆکەکە تەواو نەبووە، دوای ماوەیەك منداڵەکە گورچیلەکانی وەستا، بە دایکیم گوت: ئەمجارەیان هیچ هیوایەك بۆ ڕزگاربوونی منداڵەکەت نییە! وتی: (ئارام دەگرین‌و پشت بە خودا دەبەستین)، ئەمەی گوت‌و وەکو جارەکانی تر گەڕایەوە بۆ لای منداڵەکەی..

کەوتینە هەفتەی کۆتایی مانگی چوارەمەوە، سوپاس بۆ خودا منداڵەکە لەو ژەهراویبوونەش ڕزگاری بوو، پێمان خستە مانگی پێنجەمەوە سەیرتر ڕووی دا، منداڵەکە تووشی نەخۆشییەك هات کە هەرگیز لە ژیانمدا نەخۆشی لەو شێوەم نەدیبوو، هەوکردنێکی زۆر لە پەردەی بلوری دەوری سینگیدا، هەوکردنەکە هەموو ئێسقانەکانی سنگ‌و چواردەوری گرتبووەوە، ناچاربووم کە نەشتەرگەری کردنەوەی سنگی بۆ بکەم، تا دڵی دەرکەوێت، بەشێوەیەك لێدانی دڵی ببینین..

کاتێك بارودۆخی منداڵەکە دوای ئەو ماوە دوورودرێژە گەیشتە ئەو قۆناغە، بە دایکیم گوت: ئێمە هەموو هەوڵێکی خۆماندا، بەڵام بەداخەوە هیچ هیوایەك نییە بۆ چاکبوونەوەی منداڵەکەت، بارودۆخی بەردەوام بەرەو خراپبوون دەڕوات، لە وەڵامدا وەکو نەریتی هەمیشەیی، هیچ شتێکی نەگوت، جگە لە سوپاسکردنی خودای گەورە..

شەش مانگو نیو ئەو منداڵە لەگەڵ دایکیدا لە نەخۆشخانە مانەوە، لە کۆتاییدا سوپاس بۆ خودا منداڵەکە لە بەشی بوژانەوەی دڵ هاتە دەرەوە، بەڵام نە قسە دەکات، نە دەبینێت، نە دەبیستێت، نە پێدەکەنێت، نە دەجوڵێت..

دەزانن دوای ئەوە چی ڕووی دا، پێش ئەوەی من هەواڵتان بدەمێ؟

کێ لەو بڕوایەدایە ئەم منداڵە بەو هەموو ئازارو نەخۆشییەوە چاك ببێتەوە؟

چی چاوەڕوان دەکەن لەم دایکە ئارامگرو سوپاسگوزارە، دەبێت چی بکات، لە کاتێکدا منداڵەکەی لەسەر لێواری مەرگە! دایکی خاوەنی هیچ شتێکی دیکە نییە، جگە لە پشتبەستن بە خودای گەورەو دوعاو پاڕانەوە، بەڵام دیارە بۆ مرۆڤی باوەڕدار ئەوە لە هەموو شتێك گەورەترو گرنگترە..

لە کۆتاییدا ئەم منداڵە بە فەزڵی خودا بە تەواوی چاکبووەوە، تەنانەت بڕواکردنی بۆ خۆشمان ئاستەم بوو، ئێستا بە قاچی خۆی دەڕواتو پێشبڕکێ لەگەڵ دایکیدا دەکات.. وەکو ئەوەی هەرگیز نەخۆش نەبووبێت، چیرۆکەکە تەواو نەبووە.. ئەوەی منی گریاند ئەمە نەبوو کە لەوەوپێش ڕوویدا، بەڵکو ئەوەبوو کە لەمەودوا بیستم..

دوای ئەوەی منداڵەکە لە نەخۆشخانە چووە دەرەوە، زیاتر لە ساڵو نیوێکی پێچوو، ڕۆژێکیان یەك لە هاوکارانم لە بەشی نەشتەرگەری، هەواڵی پێدام کە پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەیو دوو منداڵدا دەیانەوێت تۆ ببینن..

وتم: ئەوان کێن؟ وتی: نایانناسم..

ڕۆیشتم بۆ بینینیان، کاتێك بینیمن زانیم دایكو باوکی ئەو منداڵەن کە پێشتر نەشتەرگەرییەکانم بۆ ئەنجام دابوو، منداڵەکە تەمەنی ببووە نزیکەی (٥) ساڵ، وەکو گوڵ وابوو، منداڵێکی ڕۆح سوكو تەندروست، وەکو ئەوەی هیچی بەسەرنەهاتبێت، منداڵەکەی تریشیان تەمەنی (٤) مانگ بوو.. بەخێرهاتنم کردنو بە گاڵتەوە لە باوکی منداڵەکەم

پرسی، ئەو منداڵە چوار مانگانە منداڵی چەندەمە؟ ژمارە (١٤)، یان (١٥)؟

بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم، وەکو ئەوەی پێم بڵێ جەنابی دکتور تۆ هێشتا ڕاستییەکان نازانیت! وتی: ئەوە منداڵی دووەممانە.. منداڵی یەکەممان ئەو منداڵەیە کە پێشتر ئەو هەموو نەشتەرگەرییانەت بۆ ئەنجامدا، ئەو یەکەم منداڵ بوو کە خودا بە ئێمەی بەخشی، دوای (١٧) ساڵ لە ژیانی هاوسەریمان.. دوای ئەوەی کە خودای گەورە ئەو منداڵەی پێبەخشین، دووچاری ئەو هەموو نەخۆشییە بوو کە خۆت دەزانی چی بەسەرهات، چاوەکانم پڕبوون لە ئەسرین، واتە ئەو دایکە ئارامگرە ئەوە یەکەم منداڵی بووەو ئەویش دوای حەڤدە ساڵ هاوسەریتی، بەوشێوەیەش خۆڕاگرو سوپاسگوزار بوو! دەستی پیاوەکەم گرتو بردمە ژوورەکەی خۆم.. پرسیارم دەربارەی خێزانەکەی کرد؟ سەبارەت بەو هەموو ئارامیو خۆڕاگرییەی؟

بێگومان ئەو دڵی بێکەڵکو وێرانە نییە، بەڵکو ئاوەدانو بە پیتە، بە باوەڕی بە خوای گەورە.. دەزانن هاوسەرەکەی چی گوت؟

گوێبگرن خوشکو برایانی ئازیز، بە تایبەت خوشکە بەڕێزەکان، بەڕاستی جێگەی شانازییە ئافرەتی لەو شێوەیە لەم سەردەمەدا..

وتی: من نزیکەی ٢٢ ساڵە هاوسەرگیریم لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا کردووە، بە درێژایی ئەو ماوەیە هیچ شەوێك نەبووە شەونوێژ نەکات، مەگەر عوزرێکی شەرعی هەبووبێت، هەرگیز نەمبینیوە لە پاشەملە باسی هیچ کەس بکات، هیچ کات درۆی نەکردووە، کاتێك لە ماڵ دەچمە دەرەوە، یان دەگەڕێمەوە، بە دەستی خۆی دەرگاکەم بۆ دەکاتەوەو پێشوازیم لێدەکاتو بەخێرهاتنەوەم دەکات، هەموو کارەکانی خۆی بە جوانترین شێوە ئەنجام دەدا، لە قسەکانی بەردەوام بوو، وتی: بەڕێز جەنابی دکتور، بەڕاستی هاوسەرەکەم ئەوەندە ڕەوشتبەرزو پڕ سۆزو وەفادارە، کە زۆرجار شەرمی لێدەکەم!

منیش گوتم: بەڕاستی شایستەی ئەوەیە شەرمی لێ بکەیت..



# منداڵی یەکەممان نابینا بوو!

هێشتا تەمەنم ٣٠ ساڵ تێپەڕی نەکردبوو، کە یەکەم منداڵمان چاوی بە دنیا هەڵهێنا، بەردەوام بیر لەو شەوانە دەکەمەوە، کە تاکۆتایی شەوو نزیکی بەرەبەیان لە نێو قاوەخانەو چایخانەو پارکەکاندا لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەمامەوە، تەواوی شەوگارە درێژەکانمان بە قسەی بێ ماناو توانجگرتن لە خەڵکیو باسکردنی ئەمو ئەو بەسەر دەبرد، بە زۆری من لاسایی کەسایەتییەکانم دەکردەوەو هاوڕێکانم دەخستە پێکەنین، لە ڕاستیدا خاوەنی بەهرەیەکی ناوازە بووم لە لاساییکردنەوەو گاڵتەپێکردندا، لە توانامدا بوو دەنگیشم بگۆڕم، وەکو ئەو کەسە قسە بکەم کە لاساییم دەکردەوە، کەس لە دەستم دەربازی نەدەبوو، تەنانەت هاوڕێکانیشم، هەربۆیە زۆرێك لە خەڵکی لێم دووردەکەوتنەوە بۆئەوەی لە بەڵای زمانی من سەلامەت بن.

لە بیرم دێت ئەو شەوە زۆر پێکەنیم، گاڵتەم بە کوێرێك دەکرد کە بە نێوبازاڕدا دەسوڕایەوە، تا لێی نزیك بوومەوەو قاچم خستە بەرقاچی، ئەویش کەوت بەزەویدا، نەیدەزانی چی بڵێت، منیش بە پێکەنینەوە خۆم کرد بە نێو خەڵکەکەدا، ئیدی وەکو

نەریتی هەمیشەییم درەنگانێکی شەو بۆ ماڵ گەڕامەوە، بینیم هاوسەرەکەم چاوەڕێم دەکات، هەستم کرد لە بارێکی خراپدایە، بە دەنگێکی کزۆڵەوە وتی: ئارام لە کوێ بوویت؟ منیش بە گاڵتەجاڕییەوە وتم: لە مەریخ! بێگومان لە ناو هاوڕێکانم.

ئیدی هاوسەرەکەم بەدەم هەڵوەرینی فرمێسکەکانییەوە وتی: من زۆر بێتاقەتم، ئازارم زۆرە، وادەزانم کاتی لە دایکبوونی منداڵەکەمان نزیکبووە، هەستم کرد، کە من هاوسەرەکەم زۆر فەرامۆش کردووە، پێویستە ئیدی گرنگی پێبدەم، تا کەمێك لە خەمو ئەرکی سەرشانی سووك ببێت، بە تایبەت ئێستا کە لە مانگی نۆهەمی سکپڕیدایە.

بۆیە بە خێرایی گەیاندمە نەخۆشخانە، بەردەوام ئازاری هاوسەرەکەم زیادی دەکرد، منیش زۆر چاوەڕێم کرد تا منداڵەکەی ببێت، بەڵام ماندووبووم لە چاوەڕوانی، ئیدی ئارامم لێبڕاو ژمارە تەلەفۆنەکەم جێهێشت تا ئەگەر منداڵەکەمان لە دایکبوو مژدانەم پێبدەن، گەڕامەوە ماڵ.

دوای کاتژمێرێك پەیوەندیم پێوەکرا، منیش بە خێرایی گەڕامەوە بۆ نەخۆشخانە، برین پێچەکەم بینی، داوام لێکرد کە ژووری هاوسەرەکەم پێ بڵێ، بەڵام ئەو داوای لێکردم سەرەتا بڕۆم بۆ لای ئەو پزیشکەی سەرپەرشتی لە دایکبوونەکەی کردبوو، منیش بە دەنگی بەرز بە سەریدا قیژاندمو وتم کام پزیشك؟ گرنگ ئەوەیە من کوڕەکەم ببینم!

بەڵام ئەو سوربوو لەسەر داواکەیو وتی: دەبێت سەرەتا بچیتە لای پزیشکەکەی.

بە ناچاری ڕۆیشتم بۆ لای پزیشك، دەستیکرد بە قسەکردن لە سەر ئارامگرتن لە کاتی تاقیکردنەوەو ڕازیبوون بە قەدەری خوای گەورە، پاشان پێی وتم، منداڵەکەت، نابینایە!

سەرم داخستو بۆ ڕابردووی خۆم دەستم کرد بە گریان، بیرم لەوە کردەوە کە پیاوە نابیناکەم خست بە زەویداو خەڵکی پێی پێکەنین!

نەمدەزانی چی بڵێم، پاشان بیرم لە هاوسەرەکەمو منداڵەکەم کردەوە، سوپاسی پزیشکەکەم کردو ڕۆیشتم بۆ بینینی هاوسەرەکەم!

هاوسەرەکەم ئافرەتێکی باوەڕدار بوو، باوەڕی پتەوی بە قەزاوقەدەر هەبوو، بینیم ئەو خەمبار نییەو سوپاسی خودا دەکات، ڕووی تێکردمو پێی وتم: ئیدی ئەوەندە گاڵتە بە خەڵکی مەکە، هەروەکو چۆن هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم کە ئەوەندە باسی خەڵکی نەکەم.

لە نەخۆشخانە هاتینە دەرەوە، منداڵە نابیناکەمان ناونا سالم، لە ڕاستیدا من هیچ گرنگییەکم پێنەدەدا، وامدەزانی هەر بوونیشی نییە لە نێوماڵدا، هەر کات ئەو دەگریا، من دەڕۆیشتمە ژوورێکی دیکە دەنووستم، هاوسەرەکەم زۆر گرنگی بە سالم دەدا، زۆریش

خۆشیده‌ویست، به‌ڵام من ڕقم لێی نه‌بوو، له‌ هه‌مان کاتدا نه‌شمده‌توانی خۆشم بووێت!

سالم گه‌وره‌ بوو، به‌ گاگۆڵکێ ده‌ڕۆیشت، ڕۆیشتنه‌که‌شی زۆر نامۆ بوو، ته‌مه‌نی له‌ ساڵ نزیکبووه‌وه‌، هه‌وڵی ده‌دا به‌ پێ بڕوات، بۆ مان ده‌رکه‌وت که‌ ناتوانێت به‌ جوانی قاچێکی دابنێ، زانیمان که‌ شـه‌له‌، ئه‌وه‌نده‌ی تر له‌سـه‌ر ده‌روونم قورس بوو، به‌مشێوه‌یه‌ ڕۆژه‌کان تێپه‌ڕین، له‌ دوای سالم دوو منداڵی دیکه‌مان بوو به‌ ناوه‌کانی عومه‌رو خالید، به‌ڵام ئه‌وان سه‌لامه‌تو ته‌ندروست بوون، هیچ گرفتێکیان نه‌بوو!

سـاڵه‌کان تێپه‌ڕین، سالم گه‌وره‌بوو، براکانیشـی گه‌وره‌بوون، من هه‌رگیز حه‌زم نه‌ده‌کرد له‌ ماڵ دابنیشـم، هه‌میشـه‌ له‌گه‌ڵ هاوڕێکانم بووم، ئه‌وانیش وه‌کو یاری ده‌سـتی خۆیان به‌کاریان ده‌هێنام.. به‌ڵام هاوسه‌ره‌ میهره‌بانه‌که‌م هیچ کات له‌ چاکبوونم نائومێد نه‌ده‌بوو، به‌رده‌وام نزای بۆ ده‌کردم، سـه‌ره‌ڕای ئه‌و هه‌موو ناله‌بارییه‌م له‌ هه‌ڵسـوکه‌وته‌کانم توڕه‌و بێزار نه‌ده‌بوو، به‌ڵام زۆر خه‌مبار ده‌بوو کاتێك ده‌یبینی گرنگی به‌ عومه‌رو خالید ده‌ده‌مو سالم فه‌رامۆش ده‌که‌م.

سالم گه‌وره‌بوو، هاوسه‌ره‌که‌م ناوی له‌ قوتابخانه‌ی تایبه‌ت به‌ نابینایان، تۆمار کرد..

من هه‌سـتم به‌ تێپه‌ڕبوونی ساڵه‌کان نه‌ده‌کرد، ڕۆژه‌کان بۆ من چون یه‌کبوون، چونکه‌ پیشه‌ی من (کارکردن، خواردن، خه‌وتن، گاڵته‌و یاریکردن بوو..).

ڕۆژێکـی هه‌ینـی کاتژمێـر (١١)ی نیوه‌ڕۆ له‌ خه‌وهه‌سـتام، ئه‌و کاته‌ بـۆ من زووبوو، بـه‌ڵام له‌به‌رئه‌وه‌ی بۆ خوانی نیوه‌ڕۆ بانگهێشـتکرابووم، هه‌سـتام خۆمگـۆڕیو بۆنم له‌ خۆمداو ویسـتم بڕۆمه‌ ده‌ره‌وه‌، له‌ هۆڵه‌که‌ چاوم به‌ سـالم که‌وت که‌ زۆر به‌ کوڵ ده‌گریا، هه‌ڵوێسـته‌یه‌کم کرد، دوای (١٠) سـاڵ یه‌که‌مجار بوو ئاوڕ له‌ گریانی سالم بده‌مه‌وه‌، لێی نزیکبوومه‌وه‌و وتم سالم بۆچی ده‌گریت؟

کاتێك گوێی له‌ ده‌نگی من بوو، یه‌کسه‌ر ژیر بووه‌وه‌، که‌ هه‌ستیکرد من له‌ نزیکییه‌وه‌م، هه‌ستم کرد ده‌یه‌وێت لێم دووربکه‌وێته‌وه‌، وه‌کو ئه‌وه‌ی پێم بڵێت: ئه‌گه‌ر تۆ باوکی منیت (١٠) ساڵه‌ له‌ کوێ بوویت؟ بۆچی بۆ ته‌نها جارێکیش له‌ ئامێزت نه‌گرتم؟ به‌ره‌و ژووره‌که‌ی ڕۆیشـت، سـه‌ره‌تا نه‌یده‌ویسـت هۆکاری گریانه‌که‌ییم پێ بڵێ، به‌ڵام من هه‌وڵمدا ئارامی بکه‌مه‌وه‌و بۆ یه‌که‌مجار وه‌کو باوکێك قسـه‌م له‌گه‌ڵدا کرد، له‌ دواییدا هۆکاری گریانه‌که‌ی بـۆ ڕوون کردمه‌وه‌و وتی: عومه‌ری برام دره‌نگ که‌وتووه‌، ئه‌مڕۆ هه‌ینییه‌ ده‌بوا زوو بچم بـۆ مزگـه‌وت، چونکه‌ له‌ ڕیزی یه‌که‌م جێگه‌ نامێنێت، منیـش بانگی دایکیم کرد، بانگی عومه‌رم کرد، هیچیان وه‌ڵامیان نه‌دایه‌وه‌، بۆیه‌ ده‌ستم به‌ گریان کرد.



بە بیستنی ئەم وتانە لە زاری منداڵێکی نابیناو شەلەوە سەراپا جەستەی لەرزاندم، سەیرێکم کردو دەستم بەسەریدا هێناو وتم: تۆ بۆ ئەوە دەگریت کە ڕیزی یەکەمی نوێژی هەینیت لە دەستدەچێت؟؟!!

وتی: بەڵێ.. بەم دیمەنە هاوڕێکانم لە بیرچووەوە، خوانی نیوەڕۆم هەر لە یاد نەما، وتم: سالم گیان، نیگەران مەبە، ئایا دەزانیت ئەمڕۆ لەگەڵ کێ دەڕۆیت بۆ مزگەوت؟ وتی: بێگومان عومەری برام! بەڵام هەمیشە ئاوا دوادەکەوێت!

وتم: نەخێر ئەمڕۆ من لەگەڵ تۆ دێم.. سالم بە بیستنی ئەم وشانە سەرسام بوو، وایزانی گاڵتەی پێدەکەم، بۆیە دەستیکردەوە بە گریان، منیش فرمێسکەکانم بۆ سڕیو دەستیم گرتو پێکەوە بە ڕێکەوتین، دەرگای ئۆتۆمبێلەکەم بۆ کردەوە، بەڵام سالم ڕازی نەبوو، وتی: مزگەوتەکە نزیکەو بە پێ دەڕۆین..

بیرم نەدەهات کۆتاجار کەیبووە چوم بۆ مزگەوت، بەڵام دوای ئەو هەموو ساڵانە ئەمە یەکەمجارم بوو، بچم بۆ مزگەوت، مزگەوت پڕبوو لە نوێژخوێن، بەڵام تێبینیم کرد لە ڕیزی یەکەمی مزگەوتەکە جێگەیەك دانراوە بۆ سالم، دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی، سالم داوای لێکردم قورئانێکی بۆ بهێنم، سەرسام بووم، لە دڵی خۆمدا وتم: سالم نابینایە چۆن دەتوانێت قورئان بخوێنێت؟ قورئانەکەم بۆ هێنا، داوای لێکردم قورئانەکە بخەمە سەر سورەتی (الكهف)، قورئانەکەی لێوەرگرتمو خستییە بەردەمی خۆی، دەستیکرد بە خوێندنەوەی سورەتەکە، چاوەکانیشی نووقاون، زۆر لام سەیر بوو، هەموو سورەتەکەی لەبەربوو، ئیدی من هەستم بە شەرمەزارییەکی زۆر کرد، دەستەکانم بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو داوام کرد خوای گەورە ڕێنمونیم بکات، سەرەتا وەکو منداڵ دەستم بە گریان کرد، زۆر ویستم گریانەکەم بشارمەوە، بەڵام نەمتوانی، هەستم کرد سالم بە دەستە بچکۆلانەکانی فرمێسکەکانم بۆ دەسڕێت، لە ئامێزم گرتو سەیرم کردو وتم: تۆ نابینا نیت، بەڵکو ئەوە منم نابینام!

پێکەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵ، هاوسەرەکەم زۆر نیگەرانی سالم بوو، بەڵام کاتێك زانی من لەگەڵ سالم لە نوێژی هەینی بووم، نیگەرانییەکەی بووە هەڵوەرانی فرمێسکی خۆشی.

ئیدی لەو ڕۆژەوە هەموو نوێژەکانم لە مزگەوتدا کردووە، بە یەکجاری لە هاوڕێ خراپەکانم ماڵاواییم کردو بوومە هاوڕێی کەسانی باشو ئاکار جوان، لەو ڕۆژە بەدواوە گرنگییەکی زۆرم بە خێزانو منداڵەکانم دەدا، بەمەش ئومێدو نزاکانی هاوسەرەکەم هاتە

دیو ماڵمان پڕ لە خۆشـــیو بەختەوەریو تەبایی بوو، ئیدی زەردەخەنە بۆ ساتێکیش لە ڕووخساری سالم جیانەدەبووەوە، هەمیشە دڵخۆشو ڕووخۆش بوو..

پاش ماوەیەك ســەفەرێکم بۆ هاتە پێش، ســەرەتا دوودڵ بووم لە ڕۆیشــتنم، بۆ ئەو مەبەســتە ڕاوێژم بە هاوسەرەکەم کرد، لەبەرئەوەی ماوەی گەشتەکەم زۆر بوو، واگومانم برد کە داواکەم ڕەت بکاتەوە، بەڵام زۆر بە خۆشــحاڵییەوە قبوڵی کرد، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پێشــتر بۆ هیچ ســەفەرێکم پرسم پێ نەکردبوو، ئیدی ڕووم کردە سالمو هەواڵی گەشتەکەم پێدا، ئەویش بە خۆشحاڵییەوە ماڵاوایی لێکردم..

ماوەی ســێ مانــگو نیوم پێچوو، لــەو ماوەیەدا هەر کات دەرفەتێکم بۆ بڕەخســایە، پەیوەندیم بە هاوســەرەکەمەوە دەکردو هەواڵی منداڵەکانم دەپرسی، زیاتر لە هەموویان تامەزرۆی دیداری ســالم بووم، ئاواتەخوازبووم گوێم لە دەنگی بێت، هەر کات پەیوەندیم دەکرد، یا لە قوتابخانە بوو، یان لە مزگەوت..

هەموو جارێك هاوسەرەکەم بە پێکەنینو خۆشحاڵییەوە هەواڵی تەندروستیو بارودۆخی منداڵەکانی پێدەوتم، بەڵام کۆتاجار کە پەیوەندیم کرد، گوێم لە پێکەنین نەبوو، دەنگیشی گۆڕابوو، وتم سڵاوی من بە سالم بگەیەنە، وتی: بە ویستی خودا! بێدەنگ بوو...

دوای تەواوبوونی ماوەی گەشتەکەم گەڕامەوە ماڵو لە دەرگام دا، ئاواتەخوازبووم سالم دەرگاکەم لێ بکاتەوە، بەڵام خالد دەرگاکەی لێکردمەوە، باوەشــی پێداکردمو هاواری کرد بابە، بابە، نازانم بۆچی کاتێك چوومە ژوورەوە هەســتم کرد ســینەم توند دەبێت.. وەکو ئەوەی شتێك ڕووی دابێت، هاوسەرەکەم هاتە دەرەوەو پێشوازی لێکردم، بەڵام ڕووخساری گۆڕابوو، وەکو ئەوەی بە زۆر خۆی خۆشحاڵ نیشان بدات، پرسیم چی بووە؟

وتی: هیچ.. وتم ئەی کوا سالم بۆ دیار نییە؟ سەری داخستو وەڵامی نەدایەوە، فرمێسك وەکو بارانی بەهار بە گۆنایدا ڕێچکەیان بەست، هاوارم کرد کوا سالم؟ سالمی من لە کوێیە؟

خالد کە تەمەنی چوار ساڵان بوو بە دەنگێکی بەریئانە وتی: ڕۆیشت بۆ بەهەشت!

هاوسەرەکەم تەحەممولی نەکرد، زۆر گریا، ئیدی ژوورەکەی بەجێهێشت، پاشان زانیم کە ســالم دووهەفتە پێش گەڕانەوەم، دووچاری نەخۆشــییەکی کتوپڕ بووەو بەو هۆیەوە گیانی لە دەستداوەو بۆ دواجار ماڵاوایی کردووە!

کەســانێك ئەگەرچی خودای گەورە بینایی چاوی پێنەبەخشــیون، بەڵام بینایی دڵو دەروونی پێبەخشیون.. زۆرن ئەوانەی چاویان دەبینێت، بەڵام دڵییان کوێرو تاریکە!

# پەیوەندی نێوان بووكو خەسوو

(چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكیدا دەكەیت، بە هەمان شـێوە هەڵسوكەوتت لەگەڵدا دەكەن)!

گومانـــی تێدا نییـــە هەر نەتەوەیەك لەم جیهانەدا خاوەنـــی نەریتو كلتوری تایبەتی خۆیانن، بەڵام هەندێك نەریت وەكو ســـتاندەری لێهاتووەو لای زۆربەی زۆری نەتەوەكانی جیهـــان بوونـــی هەیە، بـــۆ نموونە بابەتـــی ئەمجارەمان واتە: (پەیوەنـــدی نێوان بووكو خەســـوو)، ئەم نەریتە لە هەموو جیهاندا چون یەكەو دەگمەنن ئەو بووكانەی بە وێنەی دایكیان خەسوویان خۆشدەوێت، لە كاتێكدا خەسووەكانی ئەمڕۆ بووكەكانی دوێنێ بوون، بووكەكانی ئەمڕۆش خەســـووەكانی سبەینێن، بەڵام ئەم دوو كەسە كە هەر لەو ساتەوەی نازناوی بووكو خەسوو وەردەگرن، ئیدی چاویان بە یەكدی هەڵنایەتو بە بینینی یەكدی خۆشـــحاڵ نین، هەمیشـــە بە چاوی ڕقوكینەوە بۆ یەكتر دەڕوانن، لەســـەر شـــت گەلێك كـــە تەنانەت نرخی باســـكردنی نییە، نێوانیـــان هەر لە مانگی یەكەمـــەوە تێكدەچێتو



زۆرجار خەسوو ڕقەکەی بۆ کوڕەکەشی دەگوێزێتەوەو بە هۆی بووکە خانەوە کوڕەکەشی لەبەرچاو دەکەوێت.

مـــن دڵنیام لـــەوەی زۆربەی ناکۆکییەکان کە ڕوو دەدەن لە نێوانیاندا شـــتگەلێکی زۆر ســـادەو سانان، بەڵام ئەم بیروبۆچوونە وایکردووە کە ئەم دووانە بە بیستنی ناوی یەکتر بێزار ببن، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە ئەم چیرۆکە بخوێنینەوە، تا بزانین چۆن دەتوانین ئەو ناکۆکییانە بنەبڕ بکەینو پەیوەندییەکان لە شـــەڕو ناخۆشـــیو ناکۆکییەوە بگۆڕین بۆ خۆشیو خۆشگوزەرانیو خۆشەویستیو ئاسوودەیی:

خاتوونێك دەڵێت: ساڵانێك لەمەوبەر هاوسەرگیریم لەگەڵ کوڕێکی هاوپۆلی زانکۆمدا کـــرد، بەو مەرجـــەی لەگەڵ باوکیو دایکیـــدا بژیم... دوای ماوەیەکی کـــەم بۆمدەرکەوت ناتوانم لەگەڵ دایکیدا بگونجێم، واتە: خەسووم، کەسایەتیمان زۆر لە یەکدی جیاواز بوو، خەســـووم زۆر ئاکارو هەڵســـوکەوتی هەبوو کە من ڕقم لێ دەبووەوە، لەســـەرو ئەوەشەوە هەمیشە لە سەنگەری تۆڵەدابوو بەرامبەرم!

ڕۆژەکان تێپەڕیـــن، ڕۆژ لـــە دوای ڕۆژو هەفتـــە لە دوای هەفتە بـــۆ یەك چرکەش لە مشـــتومڕو دەمەقاڵێو شـــەڕو بەگژاچوون لەگەڵ یەکتردا نەوەستاین، توڕەییو نەبوونی بەختەوەریو نائارامی ماڵەکەی پڕ کردبوو، هۆکارەکەشـــی مانددووبوونی زۆرو بەدبەختی بوو بۆ منی هەژار.

لە کۆتاییدا نەمتوانی چیدی بەرگەی هەڵسوکەوتی خراپو ناشـــیرینو دیکتاتۆریەتی خەســـووم بگـــرم، لەبەرئەوە بڕیارمدا کە ڕێگـــە چارەیەك بدۆزمەوە، بۆ ئەم مەبەســـتە ڕۆیشتم بۆ لای یەکێك لە هاوڕێکانی باوکم کە ناوی (مستەر هوانگ) بوو، ئەو فرۆشیاری دەرمانی گژوگیا بوو.

لە ســـەرەتاوە ژیانی خۆم بۆ گێڕایەوە، پاشان داوام لێکرد هەندێك گژوگیای ژەهراویم پێ بدات تا بتوانم بۆ هەتا هەتایە چارەسەری گرفتەکەم بکەم!

(مستەر هوانگ) کەمێك بیری لەو کارە کردەوە، لە کۆتاییدا پێی گوتم: من یارمەتیت دەدەم بۆ چارەسەری کێشەکەت، بەڵام دەبێت جوان گوێڕادێری بۆ قسەکانمو ئەوەی پێت دەڵێم ئەنجامی بدەیتو بە تەواوی گوێڕایەڵی قسەکانم بیت.

لە ڕاستیدا بە هاوکارییەکەی زۆر شادمان بووم، هەر بۆیە بە خۆشحاڵییەوە وتم: بە چاوان (مستەر هوانگ)، بە دڵنیاییەوە تەواوی ئەو شتانە جێبەجێ دەکەم کە تۆ پێم دەڵێیت.

پاشان (مستەر هوانگ) هەستاو ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی دواوە، دوای چەند خولەکێك گەڕایەوەو لەگەڵ خۆیدا شووشەیەکی بچووکی هێنا لەسەرشێوەی دڵۆپتکێن (قطرة)، پێی وتم: بۆ ڕزگارت بوونت لە خەسووت نابێت لە سەرەتاوە ژەهرێکی کوشندە بەکاربهێنیت کە بە خێرایی کاریگەری لەسەر دروست بکات، ئەگەر وابکەیت ئەوا گومانت لێ دەکەن‌و بەو تۆمەتە دەخرێیتە زیندان.

لەبەرئەوە ئەم دەرمانەت پێ دەدەم، کە هێواش هێواش کاریگەری لەسەر جەستەی دروست دەکات، بەڵام ئەوەی پێویستە لەسەر تۆ ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێك خواردنی باش‌و بەتامی بۆ دروست بکەیت، بۆ نموونە گۆشتی مریشك، یان گۆشتی سور، ماسی...هتد، پاشان دڵۆپەیەك لەم دەرمانە بەسەر خواردنەکەدا بکە، پێویستە ڕۆژانە لەسەر ئەم بەرنامەیە بەردەوام بیت، واتە هەموو ڕۆژێك خواردنی زۆر خۆشی بۆ ئامادە بکەیت، هەروەها هەڵسوکەوتت لەگەڵیدا بگۆڕیت، وەکو هاوڕێیەکی نزیك‌و بە وەفا مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، هەرگیز دەمەقاڵە‌و مشتومڕی لەگەڵدا نەکەیت... لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە گوێڕایەڵی هەموو داواکاری‌و ئارەزووەکانی بیت، وەکو شاژنێك بۆی بڕوانە‌و مامەڵەی لەگەڵدا بکە... هەموو ئەمانە دەبێت لەو پێناوەدا ئەنجام بدەیت کە لە کاتی مردنیدا گومان لە تۆ نەکەن..

منیش بەم بەرنامە‌و پیلانە زۆر دڵخۆش بووم، بە خێرایی گەڕامەوە ماڵ، بۆئەوەی دەست بکەم بە جێبەجێکردنی پیلانەکە، بەو هیوایەی لەو ڕێگەیەوە خەسووم لەناو ببەم..

ڕۆژان هات‌و ڕۆیشت، چەند هەفتەیەك، چەند مانگێك بەسەر ئەم پیلانەدا تێپەڕی، هەموو ڕۆژێك خواردنی باشم بۆ خەسووم ئامادە دەکردو دڵۆپێك لە دەرمانەکەم دەکرد بەسەر خواردنەکەیدا.

هەمیشە بیرم لە وتەکانی (مستەرهوانگ) دەکردەوە، کاتێك دەیگوت ئاگاداربە گومانت لێ نەکەن، بە تەواوی هەڵسوکەوتم لەگەڵ خەسوومدا گۆڕی‌و لەو ڕۆژە بەدواوە هەموو کات گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبووم، زۆر دڵسۆزانە مامەڵەم لەگەڵدا دەکرد..

دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بارودۆخی ماڵەکە بە تەواوی گۆڕاو هەموو شتێك پێچەوانە بووەوە، تەنانەت خۆم بینییەوە کە هیچ کات تووڕە نەدەبووم لە دەستی خەسووم، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا هیچ جۆرە مشتومڕێکم لەگەڵ خەسوومدا نەکرد، سەرەنجام نێوانمان زۆر خۆشبوو، زۆر بە ئاسانی لەگەڵ یەکتردا دەگونجاینو مامەڵەمان دەکرد.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بە تەواوی تێڕوانینو هەڵسوکەوتی خەسووم گۆڕا، تا وای لێهات هێندەی کچەکەی خۆی خۆشی دەویستم، بەردەوام لای هاوڕێیانو نزیکانو دۆستانی باسی منی دەکردو دەیگوت باشترین ئافرەتە.

ئێستا منو خەسووم وەکو کچو دایکێك مامەڵە لەگەڵ یەکدیدا دەکەینو هاوسەرەکەشم کە دەبینێت ئەم گۆڕانکارییە گەورەیە لە نێو ماڵماندا ڕوویداوە زۆر شادمانو دڵخۆشە!

ڕۆژێکیان بە پەلە ڕۆیشتمەوە بۆ لای هاوڕێکەی باوکم (مستەرهوانگ)... پێم وت: بەڕێز (مستەر هوانگ)، تکایە ئەمجارەش یارمەتیم بدە، دەرمانێکم بدەرێ بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو ژەهرە لەناوبەرێت کە لە ماوەی ئەم شەش مانگەدا دەرخواردی خەسووم داوە، چونکە ئێستا نامەوێت خەسووم تەنانەت پەنجەیەکیشی گەرم ببێت، بە ڕاستی ئەو زۆر گۆڕاوە، بووە بە ئافرەتێکی نەرمو نیانو لەسەرخۆ، ئێستا وەکو دایکم خۆشمدەوێت، هەرگیز نامەوێت بمرێت! تکایە، تکایە ئەمجارەشیان هاوکاریم بکە! (مستەر هوانگ) زەردەخەنەیەکی کردو وتی: من هیچ کات ژەهرم نە بە تۆ، نە بە هیچ کەس نەداوە، ئەو شووشەیە تەنها کەمێك ئاوی پاکی تێدابوو.. تاکە ژەهر بریتییە لەو ژەهرەی کە لە مێشکی تۆ دابوو، کە بەو ئاراستەیەیدا بردیت بیر لەوە بکەیتەوە چۆن خەسووت لە ناوبەریت، بەڵام کە ئێستا مێشکت بە خۆشەویستی شۆردووە، ئیدی خۆشەویستیش لە نێوانتاندا چەکەرەی کردووە!

خوێنەری ئازیز،مرۆڤ چۆن مامەڵە لەگەڵ دەوروبەریدا بکات، ئەوانیش بە هەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن! دەتوانیت ئەم جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەدا تاقی بکەیتەوە کە خۆشت ناوێنو وا هەست دەکەیت ڕقیان لێتە، دڵنیام بە هەمان شێوە ڕقو کینەتان دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستیو سۆزو میهرەبانی، پەندێکی صینی هەیە دەڵێت:

ئەو کەسەی کەسانی تری خۆشدەوێت، خەڵکیش بە هەمان شێوە ئەویان خۆشدەوێت.



# لێبوردن، گەورەترە لە تۆڵەسەندن

زۆرن ئەو کەسانەی کە هەمیشە لە بیری زمانی زبرو تۆڵەو تۆڵەسەندنەوەدان، لە کاتێکدا کە تاوانێکیان بەرامبەر ئەنجام دەدرێت، ڕەنگە زۆرجار تاوانەکە بە دەستی ئەنقەستو شەڕو دوژمنایەتی نەبێت، بەڵام کەسوکارەکەیو میراتگرەکانی جگە لە زمانی تۆڵەسەندنەوە هیچ هەڵوێستیکی دیکە دەرنابڕن، زۆر دەگمەنە مێژوو ناوی کەسانێك بە نموونەو پێشەنگ تۆمار بکات، کە هەمیشە بە شوێن تۆڵەسەندنەوەوەن، چونکە هەموو مرۆڤێك دەتوانێت هەڵوێستی لێنەبوردن ڕابگەیەنێتو داوای تۆڵەسەندنەوە بکات، ئەم تۆڵەسەندنەش مەرج نییە تەنها بە دەستی خۆی بێت، بەڵکو دەتوانێت لە ڕێگەی دادگاو یاساوە داوای تۆڵەو بەندکردنی هەمیشەیی تاوانبارەکە بکات، ئەمجۆرە ڕەفتارە تەنها ویژدانی خاوەنەکەی ئاسوودە دەبێتو بە گوتەی خۆی ئەو کات ڕقو کینەی دڵی دادەمرکێتەوەو سوکنایيو ئارامی بۆ دەگەڕێتەوە کە تۆڵەی لە تاوانبارەکە کردەوە، ئەم مرۆڤانە نەپێشەنگن نە دەبنە پێشەنگ، هەرگیز لە کۆڕو کۆبوونەوەو نووسینو

ئاخاوتندا، وەکو پێشەنگی چاکەخوازو چاکەکار باس ناکرێن، بەڵام ئەو کەسانەی سەرەڕای گەورەیی ئەو تاوانەی دەرهەقیان کراوە، هەمیشە زمانی لێبوردنو سینە فراوانیو ئازادکردن بەکاردەهێنن، ئەوانە مێژوو هەڵوێستیان دەنووسێتەوە، دەبنە پێشەنگو لە کۆڕوکۆبوونەوەکاندا بە نموونە دەهێنرێنەوەو هەڵوێستییان بەرز دەنرخێنرێت، ئەوە جگە لە پاداشتی خودای میهرەبان.

با پێکەوە هەڵوێستی ئەم ئافرەتە بخوێنینەوە کە ناوی خۆی لە نێو مێژووی خاوەن لێبوردنەکاندا تۆمار کرد، پێش سێ ساڵ لەمەوبەر دوولاو بووە دەمەقاڵەیانو لە ئەنجامی بەرکەوتنی زەبرێکی توند (سهیل) کوڕە تاقانەی ماڵەکەیانو خاوەنی سێ خوشكو دایکێکی بێوەژن، گیانی لە دەست دا..

کەسو کاری بکوژەکە لەبەرئەوەی دەوڵەمەندبوون، زۆر هەوڵیاندا تا دایکی سهیل ڕازی بکەنو لە کوڕەکەیان خۆشبێت، لە بەرامبەردا پێشنیاری کۆشکێکی نیشتەجێبوونو نزیکەی حەوت دەفتەر دۆلاریان پێدا، بەڵام دایکی سهیل ڕازی نەبوو لە بەرامبەر خوێنی کوڕەکەیدا ماڵو سامان وەربگرێت، بۆیە سووربوو لەسەر ئەوەی کە چاوەڕوانی فەرمانی دادگا بکات، تا تۆڵەی کوڕە تاقانەکەی بە چاوی خۆی ببینێت!

دوای ئەوەی فەرمانی دادگا دەرچوو بە لە سێدارەدانی بکوژەکە، دایکی سهیل داوای کرد کە جارێکی دیکە دانیشتنی دادگا بکرێتەوە، لەو دانیشتنەدا دایکی سهیل لە بەردەمی قازیدا بە بکوژی کوڕەکەی گوت: ئەوا من تەنها لەبەرخاتری خودا لێتخۆشبووم، هەر ئەمڕۆ لە سکاڵاکەم سازش دەکەمو هیچ شتێکم لە تۆو کەسو کارەکەت ناوێت.. پاداشتم تەنها لە خودای بە دەسەڵاتو بەخشندەو میهرەبان دەوێت..

بە وردی سەرنج بدە، ئەم لێبوردنە چەندە گەورەیە! دایکێکی بێوەژن، خاوەنی سێ کیژۆڵەو تەنها یەك کوڕ بوو، لە خوێنی ئەو کوڕە تاقانەی خۆشدەبێتو لە بەرامبەردا هیچ دینارو دۆلارێکیش قبوڵ ناکات.. ئەمە لە کاتێکدایە کە جگە لە مووچەیەکی کەمی خانەنشینی، خاوەنی هیچ سامانو داراییەکی ئەو تۆ نین..

لێبوردەیی، سیفاتی ئازاو پاڵەوانەکانە، ئەو کەسەی داوای لێبوردن ڕەت دەکاتەوە، بە دەستی خۆی ئەو پردە دەڕووخێنێت، کە ڕۆژێك دادێت دەبێت بەسەریدا بڕوات..

ئەگەر مرۆڤ هەموو کات خراپە بە خراپە وەڵام بداتەوە، ئیدی کەی خراپە بنەبڕ دەبێت؟!

لە یەکێك لە چیرۆکە دێرینەکانی چینییەکاندا هاتووە، خێزانێك خودا منداڵێکی جوانیان پێدەبەخشێت، خزمو دۆستانو دراوسێکانیان بۆ پیرۆزباییو دەربڕینی شادیو خۆشحاڵی خۆیان سەردانی ئەم خێزانە دەکەن، هەر یەك لەوان بە جۆرێك ڕاوبۆچوونو خۆشحاڵی خۆیان بۆ خێزانو ئایندەی منداڵەکە دەردەبڕن..

**دراوسێی یەکەم:** سەردانی ئەم خێزانە دەکەنو دیارییەکی جوان پێشکەشی منداڵە چاوگەشەکەیان دەکەنو بە بینینی زۆر خۆشحاڵو ئاسوودە دەبنو دەڵێن: ئای چەند

# منداڵێکی جوان..



منداڵێکی جوانو خوێن شـــیرینە، بێگومان لە ئایندەدا دەبێتە سەرکردەیەکی بەناوبانگو لێهاتوو..

دایکو باوکی منداڵەکە بە بیســتنی ئەم قســانە زۆر شادمان بوون، زۆر زیاتر سوپاسو ڕێزو خۆشەویستیان بۆ دراوسێکەیان دەربڕیو خواردنو شەربەتو میوەیان پێشکەشکردن، دواتر بە خۆشحاڵییەوە ماڵاواییان لێکردن..

بـــۆ ڕۆژی دواتـــر دراوســـێی دووەمیان ســـەردانی کـــردنو لـــە ناخـــەوە پیرۆزباییان ئاراســـتەکردنو بە دیتنی منداڵەکەیان سەرسامیو خۆشحاڵی خۆیان نیشانداو وتیان: ئای چەنـــدە منداڵێکـــی جوانە، بێگومان ئەم منداڵە جوانو ڕۆح ســـوکە دەبێتـــە بازرگانێکی دەوڵەمەندو کەسایەتییەکی بەناوبانگ..

باوکو دایکی منداڵەکەش زۆر سوپاســـی هەستی بەرزو ئاوازەیان کردنو ڕێزی زۆریان لێگرتنو خواردنو شـــیرینیو میوەیان پێشکەشکردنو ساتێکی خۆشیان پێکەوە گوزەراندو پاشان بەڕێزەوە ماڵاواییان لێکردن..

بۆ ڕۆژی دواتر دراوســـێی سێیەمیان ســـەردانیکردن، لە کاتی بینینی منداڵەکەدا لە جیاتی پیرۆزبایی وتی: بێگومان ئەم منداڵە لە ئایندەدا ماڵاوایی لە ژیان دەکاتو دەمرێت!!

بـــاوکو دایکـــی منداڵەکە بە بیســـتنی ئـــەم وتەیە زۆر پەســـتو نیگەران بـــوون، هەربۆیە دەستیانکردە لێدانیانو هەر بە پاڵ کردییاننە دەرەوە، تەنها لەسەر ئەوەی ڕاستییەکی گوتوە!

چونکە گومان لەوەدا نییە هەر کەس لە دایك بێت، دەشمرێت ئەگەر دوای سەد ساڵیش بێت..

بەڵام تاوانی ئەم دراوســـێیە تەنها ئەوەبوو کە نەدەبوو لە کاتی ئەوپەڕی خۆشـــیو شادیدا بە قسەیەکی لەو جۆرە ئەگەرچی ڕاستو دروستیش بێت، هەستیان بریندار بکاتو نیگەرانیان بکات..

کەواتە پێویستە هەر شتێك، یان هەر وتەیەك لە شوێنو کاتی شیاوی خۆیدا بگوترێت..

ناشێت لە کاتی شادیدا بە گریان پیرۆزبایی لە بەرامبەر بکەینو لە پیرۆزبایی منداڵێکی تـــازە لـــە دایکبوودا مردن یـــادی دایکو باوکـــی بهێنرێتەوەو لە کاتـــی خەموپەژارەدا بە پێکەنینـــەوە هاوخەمـــی خۆمان دەربڕین، زۆرجار دەبینین لە کاتی پرســـەداو لەو کاتەی کە خاوەن پرســـە لەوپەڕی نیگەرانیو بێتاقەتیدایە، دۆســـتانو میوانانی دوو دوو سەریان کردووە بەسەری یەکداو قسەی خۆشو پێکەنیناوی بۆ یەکتری دەگێڕنەوە..

هەموو شتێك، یان هەموو وتەیەك شوێنی شیاوی خۆی هەیە..



# دەتەوێت هاوسەرەکەت گوێرایەڵت بێت؟

خاوەنی ئەم چیرۆکە دەڵێت: ڕۆژێکیان سـەردانی یەکێك لە هاوڕێکانم کرد، لە مێژبوو بە دیداری شـاد نەببووم، ئەو یەکێکە لەو هاوڕێیانەم کە زۆر بەختەوەرو ئاسوودەیە، هەرگیز لە دەستی تەممەڵیو کڕینی پێداویستییەکانی ناوماڵو کەلوپەل سکاڵای نەدەکرد، بە پێچەوانەوە هەرچی بویسـتایە هەر ئەو ڕۆژە هاوسـەرەکەی بۆی دەهێنایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شۆفێری تایبەتـیو خزمەتکاریان نەبوو، تا پێداویسـتییەکانی ماڵیان بۆ بکڕێت، لەو سـەردانەمدا بۆ لای ئەو خوشـکە ئەزیزەم، دوای کەمێك دانیشـتنو ئەحواڵ پرسین، داوای پەڕەو پێنووسێکم کرد، بۆئەوەی وەسـفی ئەو خواردنەی بۆ بکەم کە حەزم لێیەتی، تا بۆ نیوەڕۆ بۆمان ئامادە بـکات، پێی وتم: ئەو چەکمەجەیە بکەرەوە پێنووسو پـەڕاوی تێدایە، هەموو ئەو دەفتەرەم سەیرکرد، بۆئەوەی پەڕەیەکی خاڵیم دەستبکەوێت، تا جۆری خواردنەکەی لەسەر بنووسم، بەڵام پەڕەیەکی خاڵی تێدا نەبوو، ئەو دەفتەرە بۆ پێویسـتییەکانی ناوماڵ تەرخان کرابوو، ئەوەی زۆر سەرسامی کردم، ئەوەبوو کە بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش کەلوپەلو پێداویستییەکانی ماڵی تێدا نوسـرابوو، بە بینینـی ئەو دەفتەرە زانیم کە هۆکاری بەختەوەریو ئاسـوودەییو نەبوونی دەمەقاڵە لە نێوان هاوڕێکەمو هاوسەرەکەیدا ئەو شێوازە جوانو سەرنجڕاکێشەیە، کە پەیڕەوی دەکات، سـەیرکەن.. بزانن کاتێك ئەم خوشـکە بەڕێزەم پێویستی بە شتێك بووبێت، چۆن نامەی بۆ هاوسەرەکەی نووسیوەو داواکارییەکەی پێشکەش کردووە:



لیستی پێداویستییەکانی بەمشێوەیە نووسیبوو: ئەزیزەکەم پەنیرێکی سپی بێنە بە وێنەی دڵە سپیو پاکو بێگەردەکەی خۆت.. قەیماغیش بهێنە، ئەی جوانتر لە قەیماغ، شەکر بە وێنەی شیرینی خوێنت، تەماتە وەکو کوڵمە سورو جوانەکانی خۆت، بیبەری سور بە وێنەی هەستەکانت.. هەنگوین، ئەی هەموو تەمەنم، زەعفەران بە وێنەی ڕەنگی دڵت، صابون بە وێنەی دەستە جوانەکانت.. شکولاتە ئەی شیرینتر لە شکولاتە! دەستبەجێ بیرێکم لە شێوازی داواکارییەکانی خۆم کردەوە، من لە لاپەڕەیەکدا دەنووسم: ئەم شتانەمان پێویستە: (هێلکە، شەکر، شیری منداڵەکەت لەبیرنەچێ، دۆشاو، ئاردی کێك، برنج...)، لە ڕاستیدا ئەمە تەنها شێوەی داواکاری من نییە، بەڵکو زۆربەی زۆری خوشکان هەر بەو شێوەیە داواکارییەکانیان بۆ هاوسەرەکانیان دەنووسن..

دوای خوێندنەوەی، زۆر پێکەنیم بەو هەڵسوکەوتە سەرسوڕهێنەرو لێزانو حەکیمانەی هاوڕێکەم، وتی: ئەوە بەچی پێدەکەنی؟ وتم: بەوەی لە نێو ئەم دەفتەرەدا نووسراوە!

بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: بۆ هاوسەرەکەت ببە بە خانمێکی باش، بۆت دەبێت بە پیاوێکی باش!

دوای سەردانەکەم گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، یەکەم کار کە ئەنجامم دا، لیستێکی پێداویستی ماڵەوەم بەمشێوەیە نووسی بۆ هاوسەرەکەم: خۆشەویستەکەم، لەگەڵ دەستی خۆت قەیماغمان بۆ بهێنە، جوانتر لە قەیماغ، هەنگوینمان بۆ بهێنە.. شیرینتر لە هەنگوین، ڕۆحەکەم مایونییزت بیرنەچێت، پەنیر بە وێنەی تامی خۆت، شەکر بە وێنەی شیرینی خوێنت، شیرینی بە وێنەی قسە شیرینەکانت، تکایە دوامەکەوە، زوو بگەڕێرەوە بۆ ماڵەوە، لە دووری تۆ خەمبارین، خۆشمدەوێی ئازیزەکەم..

هاوسەرەکەم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە لە ڕووخساریدا زەردەخەنەیەك بەدی دەکرا، هەرچەندە دەیویست بیشارێتەوە، دوای ئەوەی عەلاگەکانم کردەوە، پێشتر هەمیشە کاغەزی پێداویستییەکان لەسەرەوەی هەموو شتەکان دادەنرا، بەڵام ئەمجارە کاغەزەکەم نەبینی، پرسیم کوا کاغەزەکە، بە خەندەوە وتی: خودا لێتخۆشبێت، ئەوە چیت نووسیبوو، شەرمەزارت کردم، کاغەزەکەم لە لای ژمێریارەکە بیرچووبوو، کاتێك گەڕامەوە بۆی، سەیردەکەم دەیخوێنێتەوەو پێدەکەنێت، پاشان پێی وتم: خودا بەختەوەرترتان بکات، ئەمڕۆ زۆر توڕەو بێتاقەت بووم، بەڵام کاتێك نامەکەم خوێندەوە، ئارام بوومەوە.. هەستمکرد کە من زۆر بەختەوەرم، پاشان هەموو ئەو شتانەم کڕیی کە لە نێو نامەکەدا نووسیبووت!

دوای چەند هەفتەیەك هەر کات هاوسەرەکەم دەگەڕایەوە لێی دەپرسیم، ئەرێ هیچت ناوێت بۆ خۆت، یان بۆ ماڵەوە تابیهێنمەوە؟ زەردەخەنەیەکم کردو لە دڵی خۆمدا وتم: بەڕاستی هاوڕێکەم ڕاستیکرد کە وتی: بۆ هاوسەرەکەت ببە بە خانمێکی باش، بۆت دەبێت بە پیاوێکی باش!



# چی دەکەیت...
## گەر خێزانەکەت داوای تەڵاقی لێکردیت؟

بێگومان پێکەوەژیان بە تایبەت ژیانی هاوسەری هەموو ساتەکانی خۆشیو شادیو ئارامی نییە، بەڵکو هەندێجار ناکۆکیو بیروڕای جیاوازو لە یەك تێنەگەیشتن وا دەکات کە کەشی تورەبوونو نا ئارامیو لە یەکدی زیز بوونو...هتد، بێتە گۆڕێ. بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو کاتانەدا کەسێکی لێهاتوو بیتو کۆنترۆڵ لە دەست نەدەیتو کارێك نەکەیت کە بە درێژایی ژیانت لێی پەشیمان بیتەوەو پەشیمانیش دادت نەدات، هەربۆیە پێویستە لەسەر هەمووان لە کاتی تورەبوونو ناکۆکیدا بەشی ئاشتی تێدا بهێڵینەوەو دان بە خۆماندا بگرین، بۆ ئەم مەبەستەش کەسانی بە ئەزموونو بە ئارام بکەینە پێشەنگی خۆمانو چاویان لێ بکەین، بفەرموون با پێکەوە لەم ڕووداوە ڕابمێنینو لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە تایبەت لە کاتی شەڕو ناخۆشی لە نێوان هاوسەران، پەندی لێوەربگرین:

دەگێڕنەوە جارێکیان ژنو مێردێك بۆ کڕینی کەلوپەلی نێوماڵ پێکەوە دەڕۆن بۆ

بازاڕ، لە گەڕانەوەیاندا ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوەو دەبێتە دەمەقاڵێیان، ئەمەش نامۆ نەبوو، چونکە سروشـــتی ژیانی ئەم دوو هاوسەرە وەهابوو، جاروبار دەمەقاڵێو ناکۆکییان دەبوو، دوای ماوەیەکی کەم بارودۆخیان ئاســایی دەبووەوەو هیچ ناکۆکییەك لە نێوانیاندا نەدەمــا، بــەڵام دەمەقاڵەو ناکۆکــی ئەمجارەیان جیاواز بوو لە جارەکانــی دیکە، ناکۆکی ئەمجارە گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئافرەتەکە داوای تەڵاقی لە هاوسەرەکەی کردو وتی: چیدی ناتوانــم ئەم ناکۆکیو ژیانە پڕ لە نەهامەتیو نارەحەتییە قبوڵ بکەم، بێزاربووم، ئارامم لێبڕا، توانای خۆڕاگرتنم نەما، باشــتر وایە هەر ئەمڕۆ تەڵاق نامەیەك بنووسیو کۆتایی بەم ژیانە تاڵە بهێنرێت.

هاوســەرەکە بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر نیگەرانو تورە بوو، دەستبەجێ پەڕاوێکی لە گیرفانیدا دەرهێناو تیایدا نووسی: (من فلانی کوڕی فلانم، ئەوا بە تەواوی ژیریمەوەو لە بارودۆخێکی زۆر ئاساییدا بڕیارمدا کە هەتا دواهەناسەی ژیانم دەستبەرداری هاوسەرەکەم نەبمو جگە لە ئەم هاوســەرە ئەزیزو خۆشەویستەم بە هیچ ئافرەتێکی دیکە ڕازی نەبم، چونکە هەرگیز بۆ تەنها ڕۆژێکیش ناتوانم لە دووری هاوسەرەکەم ژیان بگوزەرێنم)!

پاشــان پەڕاوەکەی خستە نێو زەرفێکی نامەوەو بە داخراوی دایە دەستی خێزانەکەی، دواتــر بــە تورەیی لە ماڵ چــووە دەرەوە، ئەمە لە کاتێکدا بــوو خێزانەکەی نەیدەزانی چی لە ناو نامەکەدا نووســراوە، وا هەســتی دەکرد ئەوە تــەڵاق نامەکەیەتیو ئیدی بەم نامەیە کۆتایی بە ژیانی هاوسەرییان دێت، لەبەرئەوە کاتێك بیر دەکاتەوە زۆر پەشیمان دەبێتــەوەو چاوەکانــی هۆن هۆن ئەســرین هەڵدەوەرێنن، بەگریانــەوە دەیگوت: بۆ کوێ ڕۆیشت؟ چی وت؟ ئایا ئەمە تەڵاق نامەکەمە، ئەمە ئەو نووسراوەیە کە کۆتایی بە ژیانی هاوســەرێتیمان دەهێنێت؟ بناغەی ژیانی چەند ســاڵەمان هەڵدەوەشــێنێت؟ هەموو ئەم پرســیارانە بە مێشــکیدا دەهاتوو دەچوو، زۆر سەرســام بوو، بەردەوام سەرزەنشتی خۆی دەکردو دەیگوت: چیم بە خۆم کرد؟ چۆن بە دەستی خۆم ژیانی خۆمم تێکدا؟

کاتێك لەم بیرکردنەوانەدا بوو لە ناکاو هاوسەرەکەی گەڕایەوە ماڵ، ڕاستەوخۆو بە بێ سڵاوکردن ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی، بەبێئەوەی یەك وشە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بڵێت!

ئەویش ئارامی لێ بڕاو چیدی نەیتوانی ئارام بگرێت، بۆیە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە

بەرەو ژووری هاوسەرەکەی ڕۆیشتو لە دەرگای دا، هاوسەرەکەشی بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوەو وتی: چیت دەوێت؟ خێزانەکەشی بە قورگی پڕ لە گریانو بە دەنگێکی زۆر نزمەوە وەڵامی دایەوە، تکات لێدەکەم دەرگاکەم لێ بکەرەوە، دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم، هاوسەرەکەشی کەمێك وەستاو پاشان دەرگاکەی لێکردەوە، خێزانەکەی پێی وت: تکات لێدەکەم با پێکەوە بڕۆین بۆ لای مامۆستایەکی ئاینی تا ڕێگە چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە، بەڕاستی من زۆر پەشیمانم، هیچ کات ناتوانم لە دووری تۆ بە ئاسوودەیی بژیم، نازانم چۆن ئەو هەڵەیەم کرد، لەو بڕوایەدا نەبووم تۆش بەو خێراییە ئەو بڕیارە جەرگبڕە بدەیت؟! تکات لێدەکەم چارەسەرێك بدۆزەرەوە؟

هاوسەرەکەشی بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: هەر بەڕاستی تۆ پەشیمانیت؟ نیگەرانیت بۆئەوەی ڕوویدا؟ خێزانەکەشی وەڵامی دایەوە، بەڵێ، بەڵێ، زۆر پەشیمانم سوێند بە خوا من ئەو مەبەستەم نەبوو، تەنها ئەو قسەیەم بەسەر زاردا هات، بەڕاستی زۆر زۆر پەشیمانم بۆ ئەو ڕووداوەی ڕووی دا.

هاوسەرەکەشی وتی: نامەکە بکەرەوەو تەماشایەکی ناوەڕۆکەکەی بکە!

خێزانەکەشی نامەکەی کردەوەو بە تەواوی نامەکەی خوێندەوە، لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات، هاوسەرەکەی لە ئامێزگرتو وتی: ئەم ئاینە چەند گەورەیە، کە تەڵاقی داوەتە دەستی پیاوان، خۆ ئەگەر بە دەست ئێمەی ئافرەتان بووایە ڕۆژی ٢٠ جار پیاوەکان تەڵاق دەدران!



# دایە.. نانی بەیانی..

کاتژمێر (٧) بەیانی بوو، منداڵەکەیان لە خەوهەڵسا، دواتر ویستی دایکی بەخەبەربهێنێت، بەڵام دایکی بە دەم داواکەیەوە نەهاتو هەڵنەسا، منداڵەکەش کە برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیبوو، شەوێکی دورودرێژ بوو هیچ شتێکی نەخواردبوو، نەیدەتوانی چیدی بەرگەی برسێتی بگرێت، بۆیە دەستیکردە گریانو بە گریانەوە بانگی دەکرد (دایە، بابە نانی بەیانی)!!

بـەڵام بەداخـەوە دایە لە بری ئەوەی بە دەم داواکەیـەوە بچێتو لە ئامێزی بگرێتو سـەرەتا بە ماچی گەرمی تێری بکات، بەسـەریدا قیژاندیو گوتی: نانی بەیانی ئێسـتا؟؟ دەڵێم برۆ بخەوە، ئێستا زووەو کاتی نانی بەیانی نەهاتووە..

منداڵەکەش لە ترسـی دایکی ڕایکردو ژووری نووسـتنەکەی جێهێشـت، بەرەو ژووی دانیشـتن ڕۆیشـتو تەلەفزیۆنەکەی داگیرسـاند، کەمێك بە دیار تەلەفزیۆنەوە دانیشت، پاشان زەنگی برسێتی جارێکی دیکە هەراسانی کرد، بۆیە بە خێرایی بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشـت، چونکە برسێتی بەسەریدا زاڵببوو، نەشـیدەوێرا بۆ جاری دووەم بڕواتو بانگی دایکی بکاتەوە، نەبادا ئەمجارەیان لە بری هاوار، لێدانیش بێتە ئاراوە..

ویستی هەر چۆنێك بێت دەستی بگاتە چەکمەجەی کەوانتەرەکە، چووە سەر تەپڵەکێك،

تا شتێك دەستبخاتو بیخواتو لە برسێتی ڕزگاری بێت.. بەداخەوە بەخت یاوەری نەبوو، لەسەر تەپڵەکەکە کەوتە خوارەوەو هەندێك کوپو قاپو قاچاخیش بەسەریدا کەوتن..

دایکە میهرەبانەکەی لە دەنگی زرڕەی مەنجەڵو کوپەکان وەخەبەرهاتو بەپەلە ڕۆیشت بۆ چێشتخانەکە، تا ببینێت چی ڕوویداوە.. منداڵەکەی لە ترسانا خۆی لە ژێر مێزی نانخواردنەکەوە شاردەوە، دایکی کە دیمەنی مەنجەڵو قاپو قاچاخەکەی بینی، منداڵەکەی لە ژێر مێزەکە دەرهێناو لە بری نان بە لێدان تێری کردو وتی: پێم نەگوتی: ئێستا کاتی نانی بەیانی نەهاتووە؟!

منداڵەکەش لە ترساندا دووبارە ڕایکردو نانی نەخوارد..

کات گەیشتە (١٢) نیوەڕۆ.. دایکی نانی نیوەڕۆی ئامادە کرد.. منداڵەکەی هاتە سەر خوانەکەو زۆر برسیانە دەستیکرد بە نانخواردن، جلوبەرگەکانی پیس کرد.. دایکی بە چاوێکی بێبەزەییانەوە سەیری کردو بە سەریدا قیژاندیو وتی: تۆ گێلو نەفامی نازانیت نانیش بخۆیت، سەیری محەممەدی پورزات بکە، ئەو زۆر لە تۆ عاقڵترە.. منداڵەکەش چاوەکانی هۆن هۆن فرمێسکیان هەڵوەراندو نانەکەی تەواو نەکردو ڕۆیشتە دەرەوە..

کات بوو بە (٣)ی پاش نیوەڕۆ.. باوکی لەسەر کار گەڕایەوە، منداڵەکە بە گەڕانەوەی باوکی زۆر دڵخۆشبوو، ویستی سەبارەت بە کوڕی دراوسێکەیان قسەی بۆ بکات، کە باوکی چەند سیدییەکی یاریو فیلمی پەروەردەیی بۆ کڕیوە، باوکی لەسەر جێگەکەی ڕاکشابوو.. منداڵەکە بە هێمنی گوتی: بابە، بەڵام وەڵامێکی نەبیست! بە دەستە بچووکەکانی سەری باوکی ڕاوەشاند، بەڵام باوکی پرخەی خەوی دەهاتو وەڵامی منداڵەکەی نەدایەوە..

کات بوو بە (٥)ی ئێوارە.. هاوڕێکانی دایکی هاتن بۆ ماڵیانو لە ژووری میوان دانیشتبوون، منداڵەکەش ڕۆیشت دەستێك جلی جوانی لەبەرکردو چووە ژوورەوە بۆ لای میوانەکانی دایکە میهرەبانو بەسۆزەکەی! دایکیشی زۆر بە توندی دەستیگرتو ڕایکێشایە دەرەوەو پێی گوت: ئەوە چیم پێگوتی؟ جارێکی دی نەیەیتە ژوورەوەو شەرمەزاری لای میوانەکانم نەکەیت! بڕۆ سەیری تەلەفزیۆن بکە، یان بڕۆ دەرەوە لەگەڵ هاوڕێکانت یاری بکە..

کات (٨)ی ئێوارەیە.. منداڵەکە گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام لە ئەنجامی یاریکردن لەگەڵ هاوڕێکانیدا جلە نوێیەکانی پیس کردبوو، هەر کە چاوی بە دایکی کەوت لە ترسا دەستیکرد بە گریان، دایکە میهرەبانەکەشی لە بری دڵنەوایی بە دەنگێکی بەرز بەسەریدا قیژاندی: خودا چاکت بۆ نەکات هەی گێلی نەفام، بۆ وات لە خۆت کردووە! تۆ ئەو جلانە ناهێنی کە لەبەرتایە! ویستی سکاڵای خۆی بۆ بکات کە کوڕی دراوسێکەیان لێیداوەو قسەی

پێگوتووە! بەڵام نەگەیشت دەمی بکاتەوە، دایکی دووبارە دەستیکردەوە بە لێدانی..

کات (٩)ی شەوە.. باوکی هات، بۆ چێشتخانەو ئەندامانی خێزان دانیشتن بۆ نانخواردنی ئێوارە.. منداڵەکە ویستی باسی کوڕی دراوسێکەیان بکات، بەڵام کەسیان گوێیان بۆ قسەکانی نەگرت، باوکی گوتی: من ماندووم، تکایە بێزارم مەکە..

کات (١٠)ی شەوە: منداڵەکە لەبەردەم یارییەکانیدا خەوی لێکەوت، دایکی هات تا هەڵیبگرێت بۆ سەر جێگەکەی خۆی، بەزەیی بۆ منداڵەکەی جوڵاو ماچی کردو وتی: خۆشمدەوێیت ئەی بێنازترینو بێبەخترین منداڵ لە جیهاندا..

باوکی کە گوێی لەو قسەیە بوو، پێکەنیو گوتی: زۆر ڕاستە!

ئەوە نموونەی تەنها یەك ڕۆژی منداڵێکە لەگەڵ دایكو باوکێکی بێبەزەییدا، دەبێت تەمەنێك چۆن بگوزەرێت؟! ڕەنگە هەمووان دوای خوێندنەوەی ئەم بەسەرهاتە وابزانین ئەوە دایکی ڕاستەقینەی خۆی نییە، بۆیە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ڕەنگە زڕ دایکی بێت، بۆیە بەزەیی بە منداڵەکەیدا نایەتەوە، نا ئەوە دایکی ڕاستەقینەیەتی، دایك وشەیەکی زۆر پیرۆزە، بە هەموو ژنێك ناگوترێت دایك، ئێمە کاتێك ناوی دایك بەرگوێمان دەکەوێت، سۆزو بەزەییو خۆشەویستیو باوەشی گەرمی مرۆڤێکمان دێتە پێش چاو، کە لێوان لێوە لە ئەوینی ڕاستەقینە، بەداخەوە لە نێو ئەو دایکانەدا کەسانێك هەن بە خۆیان دەڵێن دایك، بەو شێوەیەش مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەکەن، جگە لە هاوارو قیژەو قسەی ناخۆشو ناوناتۆرە، جگە لە خێسەو تووڕەبوونو لێدان، شتێکی دیکە پێشکەش بە منداڵەکانیان ناکەن!

دایکانێك هەن بە هەموو تەمەنیان قسەیەکی خێر، وتەیەکی خۆش، ئامۆژگارییەکی بەسوودیان پێشکەشی منداڵەکانیان نەکردووە، ڕەنگە بە هەموو تەمەنیان لێویان بەر گۆنای منداڵەکانیان نەکەوتبێت، مەگەر ئەو کاتەی منداڵەکەیان شیرە خۆرەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا گلەیی لە هەڵسوکەوتی منداڵەکانیان دەکەن.. دەبێت چەند دایك هەبێت لە نێو ئەم کۆمەڵگەیەدا بەمشێوەیە مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەن؟

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە، ئایا ئەوە پەروەردەیە.. ئێمە تاکەی ئەو هەڵانە دووبارە دەکەینەوە؟ هەتا کەی منداڵەکانمان بەو شێوە توندو تیژییەو بەقسەی ناخۆشو مامەڵەی زبر پەروەردە دەکەین؟ دەبێت کەی ئێمە بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانمان، سود لە کتێبو سەرچاوەی پەروەدەییو دەروونی وەربگرین؟! بە هیوای ئەوەی هەموو دایکێك، بە تەواوی ماناو پڕاوپڕی وشەی جوانی (دایك)، هەست بە دایکایەتیو بەرپرسیارێتی بکات، بەرامبەر نەوەکانی..

# گەر ناتوانیت پەڕی باڵندەکان کۆ بکەیتەوە، زمانت بگرە!



ڕۆژێکیـان جووتیارێك لەگـەڵ یەکێك لە هاونشـینانی گوندەکەی بـووە دەمەقاڵەیان، جووتیارەکە قسـەی ناشـیرینو نابەجێو ناخۆشی بە دراوسـێکەی گوت، بەڵام دراوسێکەی ئارامی گرتو وەڵامی نەدایەوە، کاکی جووتیاریش دوای ئەو هەراو دەنگە دەنگو قسـە پێ وتنە، گەڕایەوە ماڵ، پاش ئەوەی کەمێك پشـوویداو ماندوویەتی نەما، هێور بووەوەو بیری لەو قسـە ناخۆشو نابەجێیانە کردەوە، کە بە دراوسـێکەی وتووە، بە خۆی گوت: ئەوە من چیم بەسەرهاتووە؟ چۆن ئەو هەموو قسە ناشیرینە لە زاری من دەرچوو؟

زۆر پەشیمان بوو، خەم دایگرت، تەنها کارێك لەم کاتەدا لە دەستی بێت بۆ هێوربوونەوەی دەروونیو ئاسوودەیی ویژدانی، ئەوەیە بچێت بۆ ماڵی دراوسێکەیانو داوای لێبوردنی لێ بکات، هەر بۆیە بە خێرایی هەستاو ڕۆیشت بۆ ماڵی دراوسێکەی، بە شەرمەزارییەوە وتی: من زۆر داوای لێبوردن دەکەم، بۆ ئەو قسانەی بە بەڕێزتم گوت، لە ڕاستیدا خۆم بە شەرمەزار دەزانم، تکا دەکەم لێم ببورە، دراوسێکەشم زۆر بە دڵپاکانە داوای لێبوردنەکەی لێ قبوڵ کردم.

جوتیارەکە دەڵێت: لەگەڵ ئەوەشــدا باری دەروونیم ئاڵۆز بوو، زۆر نیگەران بووم، بەو ڕەفتارەی بەرامبەر بە دراوسێکەم ئەنجامم دا.. بەردەوام بە خۆمم دەگوت: چۆن ئەو قسە ناشیرینانە لە زاری من هاتەدەر؟

جووتیارەکە ئارامی لێ هەڵگیرابوو، کردارەکەی زۆر پێ ناخۆشــبوو، سەرەڕای ئەوەش کە دراوســێکەی داوای لێبوردنەکەی لێ قبوڵ کردبوو، بۆ ئەم مەبەســتە ڕۆیشــت بۆ لای ڕدێن ســپی ئاواییەکەو دانی بە تاوانەکەیدا ناو، پێی گوت: دەمەوێت دەروونم ئاســوودە بێت، من زۆر نیگەرانم بەو بوختانو قسە ناشیرینانەی بە دراوسێکەمم وتووە!

ڕدێن سپی ئاواییەکە پیاوێکی ژیرو دنیا دیدە بوو، بە تەنگ گرفتەکانی گوندنشینەکانەوە بــوو، پێی گوت: گــەر دەتەوێت دەروونت ئاســوودە بێت، برۆ تورەکەیــەك پەڕی باڵندە کۆبکەرەوە، پاشان لە بەردەم هەر ماڵێکی ئەم گوندەدا پەڕێك دابنێ!

جووتیارەکە بی سێو دوو دەستبەجێ هەستا بە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە.

تورەکەیــەك پەڕی باڵندەی کۆکردەوەو بەو شــێوەیەی پێی وترابــوو، لە بەردەم هەر ماڵێکی گوندەکەدا پەڕێکی دانا، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵی ڕدێن سپی ئاواییەکەو پێی گوت: ئەوەی وتت جێبەجێم کرد.

ڕدێن ســپییەکەش وتی: زۆرباشــە، ئێستا برۆ هەموو پەڕەکان کە لە بەردەمی دەرگای ماڵەکانــدا داتنــاوە، کۆیان بکەرەوە.. جووتیارەکە نەیپرســی بۆچی ئەم کارە بکەم، بەڵکو گوێڕایەڵانە ڕۆیشــت بۆ کۆکردنەوەی پەڕی باڵندەکان، بــەڵام بە داخەوە کاتێك دەچووە بــەردەم هەر دەرگایەك، دەیبینی پەڕەکە بــا بردوویەتی، تەنها ژمارەیەکی زۆر کەمی لە پەڕەکان دەســتکەوتەوە، بۆیە بە خەمباری گەڕایەوە بۆ لای ڕدێن ســپی ئاواییەکەو پێی گوت: پەڕی باڵندەکان با بردوویەتیو تەنها کەمێك لە پەڕەکان لە جێگەی خۆیان مابوون!

ڕدێــن ســپی ژیرو دنیادیــدەش پێی گوت: کوڕی خۆم هەر قســەیەك لــە زاری ئێمە دەردەچێــت، وەکــو ئەو پــەڕە باڵندەیە وایە کە لە بەردەمی ماڵــی هەر یەك لە براکانت داتنابوو، دەبینیت دانانی ئەم پەڕانە چەند ئاسان بوو؟!

بەڵام چەند قورسو گرانە گێڕانەوەی وشەکانمان بۆ نێو زارمان!!

کەواتە پێویستە لەسەرت، یان پەڕی باڵندە کۆبکەیتەوە، یاخود زمانت بگرەو ئاگاداریبە، مەهێڵە وتەی نابەجێو ناشیرینی لێ بێتە دەرەوە.



# سێ هەڵوێستی ناوازە...

جارێکیان کابرایەکی دەشتەکی لەسەر ڕێگەکەی، بۆ حەوانەوەو پشوودان ڕوو دەکاتە سێبەری درەختەکانی نێو باخێك، وشترەکەی یەخ دەداو پاشان خەوی لێدەکەوێت، پاش حەوانەوە وشترەکەی هەڵدەستێو دەچێتە نێو بێستانەکەو زەرەرو زیانێکی زۆر بە بێستانەکە دەگەیەنێت..

لەو کاتەدا خاوەن بێستانەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناو بێستانەکەیو دەبینێت ئەو بێستانەی کە زۆر پێوەی ماندوو بووەو ڕەنجی زۆری لەگەڵ کێشاوە، بەجارێك ئەو وشترە وێرانی کردووە، باخەوان ئەم دیمەنە زۆر تووڕەی دەکاتو ئارامی لێدەبڕێت، بۆیە زۆر بێبەزەییانە دەست بە لێدانی وشترەکە دەکات، تا دەیکوژێت دەستی لێهەڵناگرێت.

پاش حەوانەوەو پشوودانو خەوێکی ئارام، کابرای دەشتەکی لە خەو هەڵدەستێت، سەیر دەکات وشترەکەی لەوێ نەماوە، دەچێتە ناو باخەکە تا بەدوای وشترەکەیدا بگەڕێت، دوای گەڕان وشترەکەی بە کوژراوی دەدۆزێتەوە، دەشتەکی کە ڕێگەی دوورەو وشترەکەی تاکە هۆکاری گەیاندنی بووەو زۆر خۆشی ویستووە، بە بینینی ئەو دیمەنە زۆر تووڕە دەبێت، لەگەڵ باخەوان لێیان دەبێتە هەراو دەمەقاڵێ، سەرەنجام پەلاماری یەك دەدەنو دەبێتە شەڕیان، دەشتەکییەکە باخەوانەکە دەکوژێت، کوڕەکانی باخەوانەکە بە دەم هەراو دەنگە دەنگەکەوە دەچن، کاتێك دەگەن کار لە کار ترازاوەو دەشتەکییەکە باوکیانی کوشتووە!

ئەوانیش وەك کەسانێکی تێگەیشتوو ڕۆشنبیرو بە هەڵوێست، هەڵناستن بە کوشتنەوەی دەشتەکییەکە، بەڵکو دەیانەوێت تەسلیمی دادگای بکەن، چونکە دڵنیان دادگا خوێنی باوکیان بە فیرۆنادات‌و مافیان بۆ وەردەگرێتەوە.. کابرای دەشتەکی دەبەن بۆلای پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب «خودا لێی ڕازی بێت» دەڵێن ئەم پیاوە باوکمانی کوشتووە.. خەلیفە ڕوودەکاتە دەشتەکییەکەو لێی دەپرسێت: ئایا ئەو قسەیە ڕاستە؟ دەشتەکییەکەش دەڵێت: بەڵێ ڕاستە.. ئەوەی ڕووی داوە بۆیان دەگێڕێتەوە.. دواتر دەڵێت: تەنها داواکارییەکم هەیە.. مۆڵەتم بدەن

با بگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵو منداڵەکانمو وەسیەتێکیان بۆ بکەمو پاشان دەگەڕێمەوە بۆلاتان، ئەو کات لە سێدارەم بدەن، پێشەواو کوڕەکان زۆریان بەزەیی پێداهاتەوە، بۆیە پێیان گوت: کێ دەبێتە کەفیلت کە تۆ دەگەڕێیتەوە؟ لەو کاتەدا ئەبازەڕ بە لایاندا تێدەپەڕێت، کاتێك لە بابەتەکەیان تێدەگات، دەڵێت من کەفیلی دەبم، ڕێگەی بدەن با بڕوات بۆ لای خێزانو منداڵەکانیو وەسییەتیان بۆ بکاتو پاشان بگەڕێتەوە، ئەگەر نەگەڕایەوە من لە بری ئەو لە سێدارە بدەن! هەرچەندە پێشەوا عومەر بە ئەبا زەڕ دەڵێت: ئەوە کەفیلی ڕۆحییە، بەڵام ئەبا زەڕ قبوڵی دەکاتو دەڵێت، گەر ئەو نەگەڕایەوە من لە بری ئەو لە سێدارە بدەن!! ئیدی دەشتەکییەکە گەڕایەوە بۆ لای خێزانو منداڵەکانیو بەڵێنی دا لە ڕۆژی دیاریکراودا بگەڕێتەوە!

ڕۆژان هاتو ڕۆیشت، ڕۆژی دیاریکراو هاتە پێش، هەمووان لە شوێنی دیاریکراو چاوەڕوانی گەڕانەوەی بکوژی باوکیان بوون، بەڵام کات گەیشتە چێشتەنگاوو دەشتەکییەکە دیار نەبوو، کات بوو بە نیوەڕۆ هەر نەهات، عەسریش هاتە پێش، بەڵام دەشتەکییەکە هەر نەگەڕایەوە، کوڕەکان بە ئەبازەڕیان گوت: چۆن کەفالەتی کەسێك دەکەیت، کە نەدەیناسیتو نەدەزانی ماڵیان لە کوێیە؟

ئەبازەڕ لە وەڵامدا وتی: تا نەڵێن کەسانی چاکەو پیاوەتی نەماونو کەس متمانە بە کەس ناکات.. لەو قسانەدا بوون، کابرای دەشتەکی لە ئاسۆی شارەوە وەدەرکەوت، بەرەو ڕوویان هات، تا گەیشتە لایان! زۆر بە سەرسوڕمانەوە لێیان پرسی: بۆچی گەڕایتەوە، خۆ تۆ لە دەستی ئێمە ڕزگارت ببوو، لە کاتێکدا هیچ کەس لە ئێمە تۆمان نەدەناسیو نەماندەزانی ماڵتان لە کوێیە؟

دەشتەکییەکە لە وەڵامدا گوتی: بۆئەوەی نەڵێن ئەهلی وەفاو خاوەن پەیمانو بەڵێن نەماوە!

کاتێك کوڕەکانی باخەوانەکە ئەم دوو وەڵامەیان بیست، وتیان: ئەوا ئێمەش لێتخۆشبووینو گەردنت ئازاد بێت، بۆئەوەی نەڵێن ئەهلی لێبوردنو سینە فراوانی نەماوە!

بەڕاستی سێ هەڵوێستی زۆر سەرنجڕاکێشن... یەکەمیان بووەتە کەفیلی ڕۆحی کەسێك کە نایناسێت، دووەمیان بە قاچی خۆی دێتەوە بۆئەوەی بچێتە بەردەم پەتی سێدارە، ئەم دوو هەڵوێستە زۆر ناوازەیەش کوڕانی باخەوانەکە فێردەکات کە ببنە خاوەنی ئەو لێبوردنە گەورەیەی کە مێژوو تۆماری دەکات!

خۆ ئەوانەی پەنایان بردووەتە بەر تۆڵەو خوێنڕشتن، بە هەزارانن، بەڵام مێژوو ناویان تۆمار ناکاتو نایانکاتە چیرۆك تا ئێمە پەندیان لێوەرگرین، ئەوە وەفاو لێبوردنو خاوەن پەیمانو بەڵێنە، دەبێتە وانەو پەند بۆ ئێمەو بۆ هەموو مرۆڤایەتیو تا کۆتایی ژیان، نەوە لە دوای نەوە بۆ یەکدی دەگێڕنەوە!



# ئاكارو ڕەوشتی بەرز

ئاكار جوانترینو نایابترینو بەهادارترین سـیفەتی مرۆڤە، مرۆڤ بەبێ ئاكاری جوان بوونەوەرێكـی قێزەونـەو كەس حەز بـە هاودەمی ناكات، هەرچەندە خاوەن سـەروەتو سامانو دارایىو ڕووخساری جوانو نەسەبو بنەچەی بەناوبانگ بێت!

سـەرنج بدە، مرۆڤەكان لە دەسەڵاتی خۆیاندا نییە سەر بە چ هۆزو تیرەو ڕەگەزێكن، كـوردن، یـان ئینگلیز، توركن، یاخـود فارس، عەرەبن، یان هینـدی، ... هتد، هەروەها لە دەسـەڵاتی خۆیاندا نییە، جوانو قەشـەنگو باڵابەرزن، یاخود كورتە باڵاو ناشیرین، هیچ كـەس لە ئێمـە كاتێك لە دایكبووە، پرسـی پێنەكراوە ئاخۆ دەیەوێت، سـەربە چ هۆزو تیرەیەك بێت، خەڵكی كام وڵات بێت، دەتەوێت ڕەش پێسـت بیت، یاخود سـپی پێسـت، كەواتە هەموو ئەمانە لە دەسەڵاتی ئێمەی مرۆڤدا نییە، تەنانەت ڕەنگە مرۆڤ نەتوانێت بە ئاسـانی ببێتە خاوەنی موڵكو سـامانو داراییش، لەبەرئەوە ئەگەر سەر بە هەر هۆزو تیرەیەك بیت، جوان بیت، یان ناشیرین، دەوڵەمەند بیت، یان هەژار، نەك تەنها نەنگی نییە، بەڵكو كارێكی زۆر سروشتییە!

كەواتە هەموو ئەو شتانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێكردن، مرۆڤ خۆی هەڵینەبژاردووە،

بەڵام ئەوە ئاکارە کە مرۆڤ بە دەستی خۆی هەڵیدەبژێرێت، هەموو مرۆڤێك دەتوانێت ببێتە خاوەنی بەرزترینو جوانترین ئاکار، هەموو کەس دەتوانێت خۆی بە ئاکارە جوانەکان برازێنێتەوە، کەس ناتوانێت بڵێت من ناتوانم ببمە خاوەنی ئاکاری بەرزو بەهادار، چونکە بە نرخێکی گران نییە تا بڵێین پارەی کڕینیمان نییە، لەسەر چیایەکی ئەوەندە بەرز نییە تا بڵێین دەستمان پێی ناگات، هەمووان دەتوانین خۆمان لە سیفەتە قێزەونو ناشیرینەکان دابڕنینو لە بەرامبەردا بە سیفەتە جوانو ئاکارە بەرزەکان خۆمان برازێنینەوەو ببینە کەسێکی خاوەن ڕەوشتو بەڕێزو بە حورمەتو سەربەرز.

ئاکار ئەگەر چی دەستکەوتنی لە هەموو سیفەتەکانی وەکو ئەسڵو نەسەبو جوانیو ماڵو سامان ئاسانترە، بەڵام لە هەمووان بەهادارترو جوانترو بایەخدارترە، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بەهای ئاکاری جوان بە وردیو بیرێکی قوڵەوە ئەم نموونەیە بخوێنەرەوە:-
جارێکیان پرسیار لە زانایەکی بواری ماتماتیك کرا.. سەبارەت بە ئاکاری بەرزی مرۆڤ، جاچ پیاو بێت، یاخود ئافرەت، بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە..

- ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ڕەوشتێکی بەرزو جوانو نایابو قەشەنگ بێت، ئەوا ژمارە (١) وەردەگرێت، ئەنجامەکەی = (١).

- ئەگەر لەگەڵ ئەو ڕەوشتە جوانانەدا خاوەنی جوانیو ڕووخسارێکی قەشەنگ بێت، ئەوا ژمارە سفر بۆ ژمارە یەکەکەی زیاد دەکرێت، بەوەش ئەنجامەکەی = (١٠).

- خۆئەگەر لەگەڵ ڕەوشتە جوانو ڕووخسارە قەشەنگەکەیدا، خاوەنی ماڵو سامان بێت، ئەوا سفرێکی دیکە بۆ ژمارەکەی زیاد دەکرێت، بەوەش ئەنجامەکەی = (١٠٠).

- ئەگەر لەگەڵ ڕەوشتەجوانو ڕووخسارە قەشەنگو ماڵو سامانەکەیدا، خاوەنی نەسەبێکی ئەسڵو پاكو بەناوبانگ بێت، ئەوا دووبارە سفرێکی دیکە بۆ ژمارەکەی زیاد دەکرێت، بەمەش ئەنجامەکەی= (١٠٠٠).

بەڵام ئاگاداربە، ئەگەر تەنها سیفەتی یەکەمی تێدا نەما، واتە ڕەوشتی بەرزو ئاکاری جوان، ئەوا ژمارە یەکەکەی دەڕوات، بەمەش ژمارەکەی تەنها سفرەکانی دەمێنێتەوەو ئەنجامەکەی = (٠٠٠).

سەرنج بدە، مرۆڤ بە ڕۆیشتنی ڕەوشتی بەرز، تەنها سفرەکانی دەمێنێتەوەو سفریش بەبێ ژمارە هیچ سوودێك ناگەیەنێت، هیچ بەهایەکی نییە!



# هەر کەس بمبینێت هەرگیز ستەم لە کەس ناکات..

ڕۆژێك بە نێو شەقامی سەرەکی شاردا پیاسەم دەکرد، پیاوێکم بینی دەستی لە شانییەوە بڕابووەوە، زۆر بە داماوی بانگی دەکرد، هەرکەسێك بمبینێت، هەرگیز ستەم لە هیچ کەس ناکات!

دیمەنەکەی زۆر کاریگەر بوو، منیش لێی نزیك بوومەوەو پێمگوت: برای بەڕێز، ئەوە چیتە، چیت بەسەرهاتووە، بۆچی بەمشێوەیە دەستت بڕاوەتەوە؟

وەڵامی دایەوەو وتی: براکەم چیرۆکی من چیرۆکێکی ڕاستەقینەی سەرسوڕهێنەرە، دانیشە تا بۆت بگێڕمەوە، منیش لە تەنیشتییەوە دانیشتمو بە تاسەوە گوێم بۆ ڕادێرا..

ڕۆژانێك بوو، من بەهێزو بە توانابووم، خاوەنی پلەو پایەو دەسەڵات بووم، لە دەستەو تاقمی ستەمکاران بووم، ڕۆژێك بە لوتبەرزیو لە خۆباییەوە بە ڕێگەدا دەڕۆیشتم،

ڕاوچییەکم بینی، ماسییەکی گەورەی ڕاو کردبوو، زۆر پێی سەرسام بووم، ڕۆیشتم بۆ لایو پێمگوت: ئەو ماسییەم بدەرێ، وتی: ناتوانم ئەوە بە نرخەکەی خواردن بۆ خێزانو منداڵەکانم دەکڕم، منیش زۆر بێبەزەییانە زللەیەکم لە ڕاوچییەکە داو ماسییەکەم لێسەند.

ماسییەکەم هەڵگرتو بەرەو ماڵ گەڕامەوە، لەو کاتەدا دەستم کەوتە نێوان ددانی ماسییەکەوە، زۆر ئازارم پێگەیشت، ئەو شەوە تا سپێدە لە تاو ئازاری پەنجەم خەو نەچووە چاوەکانم، بەردەوام دەستم ڕادەژاند، بەڵام ئارامم نەبوو..

هەر کە ڕۆژ بووەوە بەپەلە ڕۆیشتم بۆ لای دکتور، سکاڵای ئازاری پەنجەم بۆ کرد، دوای پشکنین پزیشکەکە وتی: پەنجەت تووشی خۆرە بووە، ئەگەر نەیبڕیتەوە، سبەی ناچار دەبیت دەستت ببڕیتەوە، بە ناچاری ڕازیبووم پەنجەم بۆ ببڕنەوە، لەسەر ئەو ماسییە پەنجەیەکم دانا، ماوەیەکی پێچوو، ئازار دەستی پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان ئازاری دەستم نەك پەنجەیەکم، زۆری ئازار نەیدەهێشت بۆ ساتێکیش خەو بچێتە چاوەکانم، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ لای دکتور، ئەمجارەیان پێی وتم: ببورە دەبێت دەستت ببڕینەوە، ئەو کارەشیان ئەنجامدا..

ماوەیەکی تری پێچوو، باسکم کەوتە ئازار، بەڵام چ ئازارێك، ئازار نەیدەهێشت بۆ ساتێکیش چاوەکانم لێکنێم، لە هیچ شوێنێك ئارامم نەبوو، بەردەوام هاوارم دەکرد، هەموو ئەندامانی خێزانەکەشم هەراسان کردبوو، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ لای دکتورو پێمگوت، کە دوای بڕینەوەی پەنجەو دەستم، باسکم ئازاری زۆری تێدا دروستبووە، بەشێوەیەك کە ناتوانم ئارام بگرم، دوای کۆمەڵێك پشکنین، ئەمجارەشیان دکتۆرەکە پێی ڕاگەیاندم کە بە داخەوە دەبێت لە ئەنیشکتەوە دەستت ببڕێتەوە، بەناچاری ڕازیبووم، بۆ ماوەیەك هەستم بە ئارامی کرد.. زۆر ڕاستە کە دەڵێن: لەشساغی تاجێکە بەسەری لەشساغانەوەیە، تەنها نەخۆشەکان دەیبینن، ئێستا من دەزانم قەدری لەشساغیو نەبوونی ئازار چییە!

بەڵام بەداخەوە هێشتا کۆتایی نەهاتووە، دوای ماوەیەك دووبارە ئازار دەستی پێکردەوە، ئازارەکە چووە قۆڵم، کە زۆر لە ئازارەکانی پێشوو بەئازار تربوو، ئەمجارەشیان دکتۆرەکەم وتی: دەبێت قۆڵیشت ببڕینەوە، بمبورە بەڵام چارەیەکی ترمان نییە، ئەگەرنا ئازارەکە هەموو جەستەت دەگرێتەوە.

هەندێك لە دۆستانم پێیان وتم: هۆکاری ئەو ئازارە چییە؟ واتە سەرەتا لە چییەوە دروستبووە؟

منیش چیرۆکی ماسییەکەم بۆ گێڕانەوە..

پێیان وتم: ئەگەر هەر سەرەتا بە شوێن خاوەن ماسییەکەدا بگەڕایتایەو مافەکەیت بۆ بگێڕایەتەوەو داوای لێبوردنت لێ بکردایە، ئەوا تەنها ئەندامێکی جەستەت نەدەبڕایەوە!

ئێستاش تا درەنگتر نەبووە، بڕۆ بۆ لای خاوەن ماسییەکەو بە هەر نرخێك بێت بیدۆزەرەوە، داوای لێبوردنی لێ بکە، تا ئازار هەموو جەستەتی نەگرتۆتەوە!

ئیدی کەوتمە گەڕان بە دوای ڕاوچییەکەدا، زۆر گەڕام تا سەرەنجام دۆزیمەوە، کەوتم بەسەر پێیەکانیداو دەستەکانیم ماچکرد، دەستم بە گریان کردو پێم گوت: تکات لێدەکەم، لەبەر خودا لێم ببورە، تکا دەکەم.. گەردنم ئازاد بکە، داوابکە هەرچیت دەوێت تا پێت بدەم..

بەسەرسوڕمانەوە وتی: تۆ کێیت؟

من چ مافێکم بەسەر تۆوە هەیە، تا بەو شێوەیە داوای لێبوردن دەکەیت؟

وتم: من ئەو کەسەم کە بە زۆر ماسییەکەم لێسەندی، ئیدی چیرۆکی ژیانی خۆمم دوای ئەو ڕۆژە بۆ گێڕایەوە، سەیرێکی دەستی کردمو دەستی بە گریان کردو وتی: برای ئەزیزم، گەردنت ئازاد بێت، خۆزگە پێش ئەوەی درەنگ ببێتو بەمشێوەیەت بەسەربێت، بهاتیتایە بۆلام.

وتم: سوێندت ئەدەم بە خودا، ئەو کاتەی ماسییەکەم لێسەندی، دوعات لێکردم؟

وتی: بەڵێ، وتم: خودایە، ئەگەر ئەم کەسە هێزو دەسەڵاتی خۆی بەسەر لاوازی مندا سەپاندو بە ستەمو زۆرداری ئەو ڕۆزییەی کە تۆ بۆت ناردم، لێی زەوتکردم، خودایە تۆش دەسەڵاتی خۆتی نیشان بدەیت.

وتم: برای ئەزیزم، بینیت خودای گەورە چۆن هێزو دەسەڵاتی خۆی نیشاندام، لەسەر ئەو ستەمەی لە تۆم کرد، من پەشیمانی خۆم دەردەبڕمو بەڵێن دەدەم، هەرگیز ستەم لە مێروولەیەکیش نەکەم!!

بەڵێ خوێنەرانی ئازیز، ئەوە نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەیە کە ستەمی لێدەکرێت، دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوەو نزاکانی هەرگیز ڕەتناکرێتەوە.

ڕەنگە هەمووان ئاواتەخوازبین، ستەمکارەکان بەمشێوەیە هەر لە دنیادا تۆڵەیان لێوەربگیرێت، ستەملێکراو بە چاوی خۆی ببینێت، چۆن ستەمکار تۆڵەی ستەمەکەی بە چەندەها قات لێوەردەگیرێتەوە..

بێگومان هەموو ستەمکارێك تۆڵەی لێدەسەنرێتەوە، ئەمڕۆ بێت، یان سبەی!!




# پێش پچڕانی تەزووی کارەبا

پێش پچڕانی تەزووی کارەبا داپیرە لە سـوچێکی ژوورەکەیدا بە تەنها دانیشـتبوو، ئەو کاتەی کوپێك چا، لەگەڵ چەند نانێكو پارچەیەك كێكو خواردن لەسەر تەپڵەكێكی تەختە لە بەردەمی دانرابوو، بۆنی خەمیرەو زیرەو كێك بە نێو ژوورەکەیدا بڵاو ببووەوە.

لە نێو زاری داپیرەدا پەندو ئامۆژگاری زۆر قەتیس مابوون، چەندین چیرۆکی منداڵان لە بیرو ئەندێشـەیدا بوو کە لە باوانی بیستبووی، لەم کاتەدا داپیرە بانگی تاکە تاکە نەوەکانی کـرد، بـەڵام هیچ کام لەوان وەڵامیان نەدایەوە، چونکە هەر یەك لەوان بە کاروباری تایبەتی خۆیانەوە سـەرقاڵبوون، کوڕە گەورەکەیان بەرامبەر لاپتۆپەکەی دانیشتووەو بە تەواوی مانا خۆی سەرقاڵ کردووە، هەروەکو ئەوەی لە حاڵەتی جەنگدا بێت لەگەڵ جیهاندا، کچانیش وەکو نەریتی هەمیشـەیی خۆیان بەرامبەر شاشـەی تەلەفزیۆنەکان دانیشتوونو چوونەتە قوڵایی ئەو دراما دۆبلاژکراوەی کە بۆتە خولیای زۆرێك لە ماڵەکانو شەوانە چەندین کاتژمێر کاتی زێڕین بەرامبەری بە هەدەر دەدەن... بێئەوەی بیر لە ئامانجەکانی ئەو درامایە بکەنەوە...

منداڵـە بچكۆلانەكەش چووەتە نێو جیهانی یارییەوەو لەگەڵ یارییە ئەلیکترۆنیەکانیدا

یاری دەکات، باوکیشیان بە دوو مۆبایل بەردەوام وەڵامی تەلەفۆنی هاوڕێو هاوکارە بازرگانەکانی دەداتەوە، ئیدی یان تەلەفۆن دەکات، یاخود تەلەفۆنی بۆ دەکرێت...

داپیرەش دەستەکانی لەسەر گۆنای خۆی داناو کەمێك بیری لە ڕۆژانی ڕابردوی کردەوە، کاتێك نەوەکانی منداڵ بوون هەموویان دەوری داپیرەیان دەداو سەریان دەخستە سەرسنگیو بە دەم گوێگرتن لە چیرۆکە خۆشەکانی داپیرەوە خەو دەیبردنەوە، بەیانیان زوو لەسەر خوان لە دەوری کۆدەبوونەوەو چاوەڕێیان دەکرد داپیرە بە دەستە خاوێنەکانی چایان بۆ تێ بکاتو پێکەوە نانی بەیانی نۆش بکەن...

بەڵام ئەمڕۆ بە تەنها لە ژوورەکەی خۆیدا دانیشتووەو هیچ کام لە نەوەکانی لە دەوری نەماونو بەشداری دانیشتنەکانی ناکەنو لەسەر سنگی داپیرە ناخەون.. ئەمەش ژیانی زۆرێك لە داپیرەکانی ئەمڕۆیە...

لەم کاتەدا جارێکی تر داپیرە بانگی کردنەوە، بەڵام ئەمجارەشیان نائومێدیو بێتاقەتی بووە میوانیو کەس لەوان لەبەر سەرقاڵی خۆیان گوێبیستی دەنگی داپیرە نەبوون، نەیاندەزانی داپیرە چەند پێویستی بە دانیشتنو گفتوگۆکردن هەیە لەگەڵ نەوەکانیدا!

لە ناکاو تەزووی کارەبا پچڕاو تاریکی باڵی کێشا بە نێوماڵەکەدا، تێکڕای گڵۆپو سورەییاکان خامۆش بوون... ئیدی تاریکیو بێدەنگیو چاوەڕوانی بە هەموو نێو ماڵدا بڵاوبووەوە...

لەم کاتەدا باوکیان هاتو لە ژوورەکەی داپیرەدا مۆمێکی داگیرساندو ژوورەکەی ڕووناك کردەوە، ئەوانیش بە هەڵەداوان بەرەو ڕووی ژوورەکەی داپیرەهاتنو لە دەوری داپیرە کۆبوونەوە.

هەموو کۆمپیوتەرو یاریو شاشەی تەلەفزیۆنەکان بە هۆی پچڕانی تەزووی کارەباوە خامۆش بوون، بە ناچاری جێیان هێشتبوون، ڕووناکی ئەو تاقە مۆمە بووە میحوەری گرنگیدانی هەمووان...

هەموو لەسەر ئەو خوانە کۆبوونەوە کە بۆ داپیرە دانرابوو، لەبەر ڕووناکی مۆمەکە دەستیان کرد بە نانخواردن لەگەڵ داپیرەدا، کوڕە گەورەکەیان لە داپیرە نزیکبووەوەو دەستیکرد بە باسکردنی هەموو ئەو گرفتانەی لە کارە نوێیەکەیدا تووشی هاتووە...

کچە گەورەکەشی باسی پرۆژەی ئاهەنگی دەرچوونی خۆی بۆ داپیرە گێڕایەوە...

لەم کاتەدا کوڕە گەورەکەی سەرنجیدا داپیرە لە خواردنەکە نزیك نابێتەوەو نان ناخوات...

کاتێك پرسیاری لێکرد لە هۆکاری نان نەخواردنی؟

وەڵامی دایەوەو وتی: ددانەکانم ئازاریان هەیەو تەندروستیم تەواو نییە...

سەرەتا کوڕەکەی وایزانی داپیرە بە دەست گرفتێکەوە دەناڵێنێت!

هەر بۆیە لێی نزیك بووەوەو دەســـتەکانی گرتو کەمێك بە شەرمەزارییەوە لێی پرسی:
چەندێکە گیرۆدەی ئەم ئازارە بوویت؟

ئەم پرسیارە بەس بوو بۆئەوەی داپیرە کەمێك دەردە دڵی خۆی بکات، مۆمەکە بەردەوام بوو لە بەخشــینی ڕووناکیو توانەوەی لە پێناوی دەوروبەرەکەیدا، گفتوگۆی نێوان داپیرەو نەوەکانیشی بەردەوام بوو، مۆمەکە بەرەو کۆتایی دەچوو، کوڕە گەورەکەی ڕۆیشت بۆئەوەی مۆمێکی تر بهێنێت، بەڵام پێش گەڕانەوەی، کارەبا هاتەوەو نێو ماڵەکەیان ڕۆشــن بووەوەو ئامێرە کارەباییەکان وەکو تەلەفزیۆنو کۆمپیوتەرو... داگیرسانەوە، بە خێرایی هەر یەك لە ئەندامانی خانەوادە گەڕایەوە لای ئامێرەکەی خۆی، یەك بۆسەر ئینتەرنێتو یەکی دی بۆ تەماشاکردنی دراماو... هتد.

داپیـــرە جارێکی تر تەنهـا مایەوە... ئەندامانی خێزان بە هاتنـــەوەی کارەبا چوونەوە سەر ئامێرەکانی خۆیان... کەس لەوان نەیاندەزانی کە باوکیان کارەباکەی کوژاندبۆوە، هەر ئەویش جارێکی تر کارەباکەی هەڵکردبووەوە.

ڕەنگــە زۆرێك لە ئێمە هەمان مامەڵەو هەڵســوکەوتمان هەبێت لەگــەڵ باوانو داپیرەو باپیــرەدا، کەواتــە با پێکەوە بەڵێن بدەین ئیدی لەمەودوا ئەوەنــدە تەنها جێیان نەهێڵین، چونکە ئێمە لە منداڵیدا چەندە پێویســتمان بە میهری ئەوان بوو؟ چۆن چاوەڕێمان دەکرد ڕۆژانە دەستی سۆزو میهرەبانی بەسەرماندا بهێنن؟ ئێستا ئەوان پێویستیان بە میهرو سۆزی ئێمە هەیە، ئەوان چاوەڕوانن ئێمە دەستی میهرەبانی بە سەریاندا بهێنین، لە چاوەڕوانیدان کاتێــك ئێمە لەســەر کار دەگەڕێینەوە ســڵاویان لێ بکەینو ســۆزو میهرەبانیو خەندەیان پێشکەش بکەین... دەبا ئێمەش لە دەربڕینی سۆزو میهرەبانیو خۆشەویستی بۆ ئەوان چیدی کەمتەرخەمی نەکەین! دەبا ســەرقاڵبوونمان بە دنیاوە نەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی ئەوان... با چیدی کاروبارەکانی ژیان بارودۆخو کەشی گەرمی دانیشتنە خێزانییەکان تێك نەدەن!

گەر دەتەوێت هەســت بە خۆشیو شــادیو نرخی ژیان بکەیت، ئەوا ڕێزی نیعمەتەکانی خوداوەند بگرە!

بێگومــان یەکێك لە نیعمەتــە گەورەکانی خودا بۆ ئێمە دایكو باوكو داپیرەو باپیرەن، کەواتــە پێــش ئەوەی لە دەســتیان بدەین با چاکەیان لەگەڵدا بکەینو دڵخۆشــیان بکەینو هەمیشە نزای خێریان بۆ بکەین...

«تا زیندوم گوڵم بۆ بێنە بە دیاری - کە مردم گوڵم بۆچییە لە جێی نادیاری».

# سەرەنجامی ڕاستگۆیی!

لاوێك لە شــاری هەمەدان، بڕیاری دا بە مەبەســتی خوێندن بڕوات بۆ شاری بەغداد، بــەڵام پێش ئەوەی لە مــاڵ دەربچێت دایکی ئامۆژگاری کردو پێی گوت: کوڕی شــیرینم ئاگاداربــە هەرگیز درۆ نەکەیــت، چونکە بڕوادار هەرگیز درۆ ناکات، کوڕە شــیرینەکەم هەمیشــە ڕاستگۆبە، بەڵێنم بدەرێ کە هەمیشە ڕاستگۆ بیت، ئەو کات مۆڵەتت دەدەم کە بچیت بۆ خوێندن، ئەویش بەڵێنی پێدا کە هەمیشە ڕاستگۆ بێت.

ئیــدی لەگــەڵ کاروان بە ڕێکەوتن لە هەمەدانەوە بەرەو شــاری بەغداد، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك ڕێگەیان بڕی، لە پڕ شەوێك کەوتنە نێو کەمینی ڕێگرو چەتەکانەوە، کاتێك زانیــان هەرچواردەوریان گیراوەو پێیان وتن: دەســتان بەرزکەنــەوە، دزەکان کاروانچیو بازرگانەکانیــان ڕیزکردو یەك یەك خۆیانو بارەکانیان دەپشــکنی، دەگەیشــتنە لای هەر کەســێکیان پرســیاریان لێدەکــرد چیت پێیە؟ لــە وەڵامدا دەیانگوت هیچمــان پێ نییە، ئەوانیش دەیانپشکنینو هەرچی شتی گرانبەهاو بەنرخ بووایە لێیان دەسەندن، لاوەکەش دانیشتبوو، چاوەڕێ بوو سەرەی ئەمیش بێتو دزەکان بگەنە لای، کاتێك یەکێك لە دزەکان بە لایدا تێپەڕی، بینی لاوێك، کە ڕووخساری لە بازرگانو کاروانچی ناچێت، جلوبەرگێکی ئاســایی لەبەردایەو لە دەوڵەمەندو خاوەن ســامانیش ناچێت، ویســتی بە ڕێزەوە بەلایدا بڕواتو کەسی دوای ئەو بپشکنێت، بەڵام سەرزارەکی پرسیارێکی لێکردو وتی: ئایا شتێکت پێیە؟ پرسیارەکەی بە دەم ڕێگەوە کرد، چونکە دڵنیابوو لەوەی وەڵامەکەی نەخێرە!



بــەڵام وەڵامەکەی سەرســامی کردو لە جێی خۆیدا ڕاوەســتا، لاوەکــە وتی: بەڵێ (٤٠) دینارم پێیە، (٤٠ دیناری ئەو کاتە پارەیەکی زۆر بووە)..

دزەکە بڕوای بە گوێیەکانی خۆی نەکرد کە شتی وای بیستبێت، هەر بۆیە بۆ جاری دووەم هەمان پرسیاری لێکردەوە، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە: بەڵێ (٤٠) دینارم پێیە، دزەکە واگومانی برد کە لاوەکە گاڵتەی لەگەڵدا دەکات، دوای ئەوەی دزەکە دڵنیابوو کە لاوەکە ڕاســتدەکات، بە ڕاســتگۆیی لاوەکە زۆر سەرســام بوو، پێی گوت: وەرە لەگەڵم بۆ لای ســەرکردەکەمان، کاتێك گەیشــتنە لای ســەرکردەکەیانو دزەکە ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، ســەرکردە هەمان پرســیاری ئاڕاستەکرد، لاوەکەش هەمان وەڵامی دایەوە، سەرکردە پێی گوت: لە کوێ شاردووتەوە؟

ئەویــش لە بنباڵیــدا پارەکەی دەرهێنا، ســەرکردەی چەتەکان زۆر پێی سەرســام بوو، پارەکەی ژمارد (٤٠) دینار بوو، پاشان سەرکردە پێی گوت: چی وای لێکردیت دانبنێی بەوەدا کە تۆ ئەو پارەیەت پێیە، لە کاتێکدا هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووین کە تۆ خاوەنی ئەو بڕە پارەیە بیت؟ لە شوێنێکیشدا پارەکەت شاردبووەوە کە ئێمە هەرگیز پەیمان پێنەدەبرد؟

لاوەکە لە وەڵامدا گوتی: کاتێك لە ماڵ دەرچووم دایکم ئامۆژگاری کردم کە هەمیشــە ڕاســتگۆبمو هەرگیز درۆ نەکەم، دایکم بەڵێنــی لێوەرگرتم کە درۆنەکەم، منیش بەڵێنم پێداو هەرگیز ناپاکی لە بەڵێنەکەی ناکەم!

ســەرکردەی چەتــەکان وتی: ئــەم لاوە ناپاکی لە بەڵێنی دایکی نــاکات، کەچی ئێمە ناپاکی لە بەڵێنی پەروەدگارمان دەکەین، ســەرکردە بە وتەکانی لاوەکە زۆر سەرسام بوو، هۆن هۆن ئەسرین بــە چاوەکانیدا دەهاتە خوار، ئاوڕێکی دایەوە بۆ لای لاوەکەو وتی: دایکت ئامۆژگاری کردیو تۆش ئامۆژگاریو بەڵێنەکەیت پاراســت، ئێمەش ســاڵانێکە ڕێگە لە خەڵکی دەگرینو ماڵو سامانیان بە ناڕەوا زەوت دەکەین، ئێستا لە بەردەمی تۆدا ئەی لاو من تەوبەو پەشیمانی دەردەبڕمو دەگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگار، پاشان هەموو هاوڕێکانی بانگ کردو تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش لەگەڵ ســەرکردەکەیان لە کارو خراپەکانی پێشــوویان پەشــیمان بوونەوەو تەوبەیان کرد، هەموو ئــەو ماڵو کەلوپەلە بە نرخەش کە لە کاروانەکەیان زەوت کردبوو، گێڕایانەوە بۆ خاوەنەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا پاسەوانی کاروانەکەیان کرد تا گەیشتنە شاری بەغداد..

هەمــوو ئەمانەش تەنها بە هۆی ڕاســتگۆیی ئەو لاوەوە بوو، کــە دواتر بووە ئەو زاناو خواناسە ناسراوەی، کە ناوبانگی جیهانی گرتەوە، ئەویش (شێخ عەبدولقادر گەیلانی) بوو.

دەگێڕنەوە پیاوێکی نەخۆش، هەر کاتێك بڕۆیشتایە بۆ لای پزیشك، دوای پشکنینو شیکارییەکان، پزیشك پێی دەگوت: لە ڕاستیدا تۆ هیچ نەخۆشییەکت نییەو کەسێکی تەندروستیو ئالوودەی هیچ گرفتێك نەبوویت.

نەخۆشەکە قەناعەتی بە وتەی پزیشکەکان نەدەکردو لەو بڕوایەدابوو دووچاری نەخۆشییەکی ترسناك هاتووە، بەڵام پزیشکی شارەکەی خۆی ناتوانن ئەو نەخۆشییەی بدۆزنەوەو چارەسەری پێویستی پێ بدەن، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژێك بڕیاریدا بچێتە پایتەخت بۆ لای پزیشکێکی بە ناوبانگو شارەزا، کاتێك گەیشتە پایتەختو چووە لای ئەو پزیشکەی ناونیشانی وەرگرتبوو، پێی گوت: جەنابی دکتۆر من هەستدەکەم نەخۆشم،

# چارەسەری نەخۆشە وەهمییەکان

بۆ ئەم مەبەستە چوومەتە لای زیاتر لە(١٠) پزیشك، زۆرێك پشكنینیان بۆ ئەنجام داوم، بەڵام هەموو پزیشكەكان هاودەنگن لەسەر ئەوەی من هیچ نەخۆشییەكم نییە!

پزیشكەكە وتی: ئەو شیكاریو تیشكانەی بۆیان ئەنجامداوی نیشانم بدە، دوای سەیركردنو لێكۆڵینەوەی هەموو شیكاریو تیشكو سۆنەرەكان، پزیشكەكە بۆی دەركەوت كە لە ڕاستیدا ئەم كابرایە هیچ نەخۆشییەكی نییەو تەندروستی زۆرباشە، بەڵام هەستیكرد گرفتی ئەم پیاوە ئەو بیرۆكە نێگەتیفەیە كە لە ناخیدا چاندویەتی، كورد وتەنی واهیمەیەتی!

هەر بۆیە پزیشكەكە پێی گوت: من چارەسەرێكی ئەفسووناویم لایە، بە وەرگرتنی بە تەواوی چاك دەبیتەوەو هیچ نەخۆشیو نارەحەتییەكت نامێنێت.

نەخۆشەكە وتی: جەنابی دكتۆر تكا دەكەم هەرچی زووە ئەو چارەسەرەم پێ بڵێ؟!

دەزانیت دكتۆرەكە چی كرد؟

جۆرێك حەبی بۆ نووسی، پێی گوت ڕۆژی سێ دەنك دوای نانخواردن بخۆ، پاش دە ڕۆژی تر سەردانم بكەرەوە.

دوای تەواوبوونی ماوەی دیاریكراو، نەخۆشەكە سەردانی جەنابی دكتۆری كردەوە، پزیشكەكە پرسیاری لە تەندروستی كردو وتی: ئێستا تەندروستیت چۆنە؟

نەخۆشەكە وتی: سوپاس بۆ خوا بە تەواوی چاك بوومەتەوەو هیچ ئازارێكم نەماوە.

ئایا دەزانیت ئەو چارەسەرە ئەفسووناوییە چی بوو؟

دەرمانێك بوو تەنها بۆ ڕەزامەندیو باری دەروونی نەخۆشەكە بوو، ئەو حەبانە هیچ ماددەیەكی دژە ڤایرۆس، یان كیمیاوی تێدا نەبوو، بەڵكو تەنها شەكری تێدابوو، بە تایبەت دروستكرابوو بۆ ئەو نەخۆشانەی واهیمەیان هەیە، واتە بیرۆكەی نێگەتیفیان بە مێشكی خۆیان داوەو وا هەست دەكەن جۆرە نەخۆشییەكیان هەیە، بەڵام پزیشكەكان لە دۆزینەوەی دەردەكەیان دەستەوسانن!

بیرۆكەی خراپ، هۆكاری سەرەكییە بۆ دروستكردنی واهیمە، بۆ خەمباری، بێهیواییو نائومێدی، هیچ كات بیر لەم جۆرە بیرۆكانە مەكەرەوە، چونكە سەرەنجام گیرۆدەی ئازارێك دەبیت كە لە ڕاستیدا بوونی نییە.

گەر بیرۆكەیەكی خراپ چووە مێشكت، نەخۆشییەك دەچێتە لەشت.

# ئاكامی تووڕەبوون

لــە نێــو ماڵەكــەی خۆیانداو لــە كاتــی یاریكردندا لەگەڵ خوشــكەكانیدا، شوشــەی پەنجەرەكەی شكاند، باوكی گوێی لە دەنگی شكاندنی شوشەكە بوو، بە خێرایی ڕۆیشت بۆ ژووری منداڵەكانیو وتی: كێ ئەو شوشەیەی شكاند، هەموو دەستیان بۆ كوڕەكەی ڕاكێشا!

باوكەكە زۆر تووڕەبوو، بەشــێوەیەك كە نەیتوانــی كۆنترۆڵی خۆی بكات، دارێكی هەڵگرتو كەوتە لێدانی دەستی منداڵەكەی، تا توانی لێی دا، منداڵەكە لە ژێر دەستی باوكیدا زۆر گریاو هاواری كردو پاڕایەوە، بەڵام نە كەســێك بە دەمییەوە چوو، نە باوكیشــی ڕەحمی پێكرد، تا تووڕەبوونەكەی دامركایەوە لە منداڵەكەی دا، پاشان قاچەكانی ڕاكێشاو خستییە سەرجێگەكەی..

منداڵەكە لە تاو ئازاری شــوێن دارەكانی، ئەو شــەوە خەو نەچــووە چاوەكانی.. بەڵام كەسێك نەبوو تەنانەت دڵنەوایشی بكاتەوە..

بۆ بەیانی دایكی هات بۆ لای، تا لە خەو هەڵیســێنێت، بەڵام بینی دەســتەكانی شــین هەڵگــەڕاوەو ئــازاری زۆری هەیە، زانی كە منداڵەكەی چ كارەســاتێكی بەســەرهاتووە، بە دەنگی بەرز قیژاندیو هاواری كرد، هاوســەرەكەی بەپەلە خۆی گەیاندە لایان تا بزانێت چــی ڕوویــداوە، ئەویش بە بینینی دەســتەكانی منداڵەكەی زۆر سەرســام بــوو، بەپەلە خستییە نێو ئۆتۆمبێلەكەیەوەو بردی بۆ نەخۆشخانە..

دوای پشکنین پزیشکەکە پێی ڕاگەیاندن کە دەبێت هەرچی زووە دەستی منداڵەکەیان ببڕێتــەوە، چونکە دەســتەکانی ژەهــراوی بوون، لەبەرئــەوەی ئــەو دارەی بەکارهاتووە بــۆ لێدانی منداڵەکــە بزماری کۆنی ژەنــگاوی پێوەبووە، باوکەکە لەبــەر تووڕەبوونی لە ڕادەبــەدەری بزمارەکانــی نەبینیبوو، هەر بۆیە لە کاتی لێدانەکــەدا ژەهر دزەی کردۆتە نێو دەســتی منداڵەکەوە، تاکە چارەســەریش بریتیە لە بڕینەوەی دەســتەکانی، بۆئەوەی ژەهرەکە نەڕواتە نێو هەموو جەستەیەوە..

باوکەکە بە بیســتنی ئەم هەواڵە زۆر نیگەرانو خەمبار بوو، فرمێســک وەکو جۆگەلە بە چاوەکانیدا دەهاتنەخوار، بە پزیشکەکەی گوت: ئێستا دەبێت ئێمە چی بکەین، تۆ چی دەڵێیت؟ ئایا ڕێگە چارەیەکی دیکە هەیە بۆئەوەی دەستی کوڕەکەم نەبڕێتەوە؟

پزیشــکەکە وتی: هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکە نییە، تەنانەت نابێت دوابکەوێت، دەبێت هەر ئەمڕۆ دەستی ببڕینەوە، چونکە ئەگەر بکەوێتە سبەی لەوانەیە پێویست بێت لە ئەنیشکییەوە واتە باســکی ببڕێتەوە، ئەگەر لەوەش زیاتر درەنگ بێت، لەوانەیە ناچاربین قۆڵی ببڕینەوە.. هەرچەندە درەنگتر بێت ئەگەری ئەوەی هەیە زیاتر ژەهرەکە دزە بکاتە نێو لەشییەوە..

باوکەکە هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەمدا نەما، جگە لە ڕازیبوون بەوەی دەســتی کوڕەکەی ببڕنــەوە، نەشــتەرگەرییەکە ئەنجامدراو دەســتی کوڕەکەی بڕایــەوە، دوای ئەوەی بەنج بەریداو کوڕەکە چاوەکانی کردەوەو بە تەواوی هۆشــی هاتەوە، بینی دەســتی بڕاوەتەوە، سەیرێکی باوکی کردو وتی: بابەگیان سوێند دەخۆم لەمڕۆ بەدواوە هیچ شتێك نەشكێنم، هیچ شتێك خراپ نەكەم، بە مەرجێك تۆش دەستەكانم بۆ بگێڕیتەوە؟!

باوکەکە بە بیســتنی ئەم دەربڕینەی کە لە ناخی پاکی منداڵەکەیەوە دەرچوو، ئارامی لێبڕاو نەیتوانی لەوە زیاتر خۆی بگرێتو سەیری چاوەکانی منداڵەکەی بکات، هەموو ڕێگەکانی لەبەردەمدا تەســك ببووەوە، ڕێگەیەکی بۆ دەربازبوون لەو بارودۆخە ناخۆشــە شك نەدەبرد، چەندە ئاستەمە هەموو کات سەیری دەستی بڕاوی جگەر گۆشەکەی بکات، کە هۆکارەکەی خۆی بووە؟!

ئەوەش ئاکامی تووڕەبوونو کۆنترۆڵ نەکردنی خود، بێگومان هەر کارێك، لە کاتی تووڕەبووندا ئەنجام بدرێت.. ئاکامەکەی پەشیمانییەکە کە دادی خاوەنەکەی نادات.. لەبەرئەوە پێش ئەوەی تووڕە ببیتو کار لە کار بترازێت، دەتوانیت کۆنترۆڵی خۆت بکەیت، بۆئەوەی لە تووڕەبوون دوور بکەویتەوە، ئەم چیرۆکەو دەیان چیرۆکی دیکەی لەم شێوەیە یادی خۆت بهێنەرەوە.




# پێویستت بە بەرد هەیە؟

بازرگانێك بە سواری ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی کە لە جۆری (جاکوار) بوو، بە نێو یەکێك لە شەقامەکاندا بە دڵێکی خۆشەوە بەرەو نووسینگەی کارەکەی دەڕۆیشت، لە ناکاو ئۆتۆمبێلە نوێیەکە کە چەند ڕۆژێك بوو کڕیبووی، بە بەردێکی گەورە لە لای ڕاستی شەقامەکەوە پێکرا!

بازرگانەکە بە خێرایی لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی تا بزانێت کێ بوو ئەو بەردەی گرتە ئۆتۆمبێلەکەیو سەیری ئەو زیانەش بکات کە بەر ئۆتۆمبێلەکەی کەوتووە...

لەو کاتەدا منداڵێکی بینی لە سووچێکی شەقامەکەدا وەستابوو، کە بە ڕووخسارییەوە نیشانەی ترسو دڵەڕاوکێ دیار بوو..

بازرگانەکە لە کاتێکدا پەستیو تورەیی نێوچەوانی تاریك کردبوو، لە منداڵەکە نزیك

بووەوە.. یەخەی منداڵە بێچارەکەی گرتو بە دیوارەکەوە نووساندیو زۆر بە توڕەیی پێی گوت: نەزان بۆچی ئەو کارەت کرد، بۆ ئۆتۆمبێلەکەت لەکەدار کردم، بۆ ئەو بەردەت گرتە ئۆتۆمبێلەکەم؟

دەزانیت بەم کارەت دەبێت هەموو سەروەتی خۆشتو باوکیشت بدەیت بۆ پڕکردنەوەی ئەو زیانەی بەر ئۆتۆمبێلەکەم کەوتووە...

لەو کاتەدا هۆن هۆن فرمێسك لە چاوی منداڵەکە دەهاتە خوارەوە، بە قوڕگێکی پڕ لە گریانو بە چاوی لە ئەسرینو بە دەنگێکی کزۆڵو خەمبارەوە بە بازرگانەکەی گوت: (زۆر بە داخەوەم، بۆ ئەو ڕووداوە، بمبورە...)!

لە ڕاستیدا من نەمدەزانی چ کارێك بکەم، لە بەیانی زووەوە لەم شوێنەدا وەستاوم، چاوەڕێم کەسێك ئاوڕم لێبداتەوەو لایەکم لێ بکاتەوە، بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە، تەنها کەسێك بە دەممەوە نەهات.. پاشان لەگەڵ هەڵوەرینی فرمێسکەکانی ئاماژەی بۆ ئەوبەری شەقامەکە کرد، کوڕێك لە سەر زەوییەکە کەوتبوو، دواتر بە دەم گریانو هەنسکەوە بەرەو لای کوڕەکە ڕۆیشتو گوتی: ئەم کوڕەی لە نێو ئەم چاڵەدا کەوتووە برامە!

ئەو ناتوانێت بە ڕێگەدا بڕوات، قاچەکانی بە تەواوی لە کارکەوتوون... لەگەڵ ئەم برایەمدا لەم ڕێگەیەوە دەڕۆیشتین، پاڵم بە کورسییەکەیەوە دەنا، لە ناکاو هاوسەنگی کورسییەکە تێکچوو، کورسییەکە لە دەستم ترازاو کەوتە ئەم چاڵەوە، منیش زۆر هەوڵمدا بەرزی بکەمەوەو بیخەمە سەر کورسییەکە، بەڵام نەمتوانی، دەستم لە زۆر ئۆتۆمبێل ڕاگرت تا یارمەتیم بدەن، بەڵام کەس نەوەستا، براکەشم لەو چاڵەدایە، ئیدی دەبوا من چیم بکردایە تا کەسێك ئاوڕم لێ بداتەوەو هاوکاریم بکات؟! تەنها ڕێگەیەك کە بە بیرمدا هات بۆ ڕزگارکردنی براکەم ئەوەبوو کە بەردێك بگرمە ئۆتۆمبێلێك تا خاوەن ئۆتۆمبێلەکە لەبەر ئۆتۆمبێلەکەی خۆی ڕابووەستێتو حاڵو گوزەرانی ئێمەش ببینێو یارمەتیم بدات بۆ دەرهێنانی براکەم!!

خاڵەگیان ئێستا ئامادەیت یارمەتیم بدەیت تا براکەم لەو چاڵە دەربهێنینەوەو بیخەینە سەر کورسییەکەی خۆی؟!

بازرگان بە بینینی ئەم ڕووداوە یەکجار خەمبار بوو، ماوەیەك بە سەرسـامی ڕاوەستا، باوەشی بە منداڵەکەدا کردو داوای لێبوردنی لێکرد...

پاشـان باوەشـی بە منداڵە ئیفلیجەکەدا کردو لە چاڵەکە دەریهێناو خسـتییە سـەر کورسـییەکە، دەسـڕێکی لە گیرفانیدا دەرهێنـاو برینەکانی بۆ پاککـردەوە، کە بە هۆی کەوتنە نێو چاڵەکەوە دووچاری هاتبوو..

پاشـان منداڵەکە زۆر سوپاسـی بازرگانەکەی کردو لێی پرسـی: ئێستا دەبێت من چی بکەم بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکەت؟

بازرگانەکەش وەکو کەسـێکی میهرەبان دەستی بە سەریدا هێناو وەڵامی دایەوە، کوڕی شیرینم خەمبار مەبەو شتێکی ئەو تۆ نییە، ئێوە خۆش بن، ئۆتۆمبێل شایەنی باسکردن نییە...

ئەوەش کە جێگەی سەرسـوڕمان بوو ئەوەبوو، کە بازرگانەکە بڕیاریدا ئۆتۆمبێلەکەی چـاك نەکاتەوە، بۆئەوەی هەر کات سـەیری کرد ئەو یادەوەرییـەی بیربێتەوە، هەروەها بۆئەوەش کە هیچ کەسێکی دی ناچار نەبێت بەردی تێبگرێت تا ئاوڕی لێ بداتەوە....

لە ڕاسـتیدا ئێمە لە ڕۆژگارێکدا دەژین، سـەرقاڵیو خەمەکان تیایدا یەکجار زۆر بووە، هەمووان لە هەوڵی کۆکردنەوەی سـەروەتو سـاماندان... واگومان دەبەین تا سـەروەتو سامانمان زۆر بێت، بەختەوەریمان زیاد دەبێت!

نازانین کە بەختەوەری لە زۆری سـەروەتو سـاماندا نییە، چەندین کەس هەیە لەم ژینەدا خاوەنی سەروەتو سامانی بێ شومارن، بەڵام خاوەنی بەختەوەری نین...

لـە کۆتاییدا دەڵێین: ڕەنگە زۆر کەس هەبن پێویسـتیان بـە ئاوڕدانەوەیەك هەبێت، بەڵام کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە، تکایە با چیدی پێویستت بە بەرد نەبێت بۆ ئاوڕدانەوە لە هەژارانو بێنەوایان...



# چاکەکان ئاشکرا بکە.. خراپەکان بشارەوە!

کاتێـك هەر یەکێك لە ئێمە دووچاری ناخۆشـی، یـان گرفتێك دەبین، هاوار دەکەینو دەڵێین: ژیان پڕە لە دەردەسـەریو ناخۆشـیو خەمو خەفـەت، کاتێك دووچاری گەرماو ناڕەحەتییـەك، یاخود دەردەدارییەك بووین، بـە دڵنیاییەوە دەڵێین: مرۆڤ هیچ کات لە نێو جەنجاڵییەکانی ژیان ناحەوێتەوەو پشـوو نـادات.. ئەمە حاڵو بیرکردنەوەی زۆرێك لە مرۆڤەکانی ئەمڕۆیە، لە ڕاسـتیدا پێویسـتە هەر یەك لە ئێمە بە هۆشـیارییەوە ژیان بگوزەرێنین، ئەگەرنا کاتێك کەسـێك فێڵێکی لێکردین، یـان درۆیەکی لەگەڵدا کردین بە ڕەشبینیو نائومێدییەوە بۆ ژیان دەڕوانینو دەڵێین: ژیان پڕە لە مرۆڤی گورگ ئاسا!

لـەم وتـارەدا داوا لە تۆی خوێنەر دەکەم، بە جوانیو سـەرنجی وردەوە بڕوانیت بۆ ژیان، هیوا بە خۆت بدەو هەمیشە خێرو چاکەو خۆشەویستی بڵاوبکەرەوە، ئەگەر وانەکەیت ئەوا لە دنیادا لە دەوروبەرت بێ هیواو ڕەشبین دەبیت، یان دەبیتە کەسێك هەمیشە هەواڵی ڕەشبینیو بێ هیواییو نائومێدی بڵاودەکەیتەوە.. لەو کەسانە مەبە کە هەمیشە دەڵێن: مرۆڤ تیاچووە، ژیان نەماوە، پڕە لە ناڕەحەتی، هەرگیز هەناسـەیەکی خۆشـی هەڵناکێشـین، بە پێچەوانەوە ببـە بـەو مرۆڤەی بە هیواو ئاواتو گەشـبینییەوە بـۆ ژیان دەڕوانێت، چیرۆکی گەشـبینان بخوێنەرەوەو هەوڵبدە وەکو ئەوان بیربکەیتەوە، با پێکەوە لەم چیرۆکە کورتە ڕابمێنین:

دەگێڕنـەوە پیاوێکـی باشو گەشـبینو خواناس، بـە بیابانێکدا دەڕۆیشـت، لە ڕێگەدا چاویکەوت بە پیاوێك لەسـەر ئەو لمە گەرمەی بیابان زۆر بە خەمبارییەوە ڕاکشـابوو، حاڵـی زۆر خـراپ بـوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابـوو، وەخت بوو گیان بـدات، بە دەنگێکی

کزۆڵەوە سـکاڵای تینویەتیو برسـییەتی دەکردو دەیگوت: کێ قومێك ئاوم پێ دەدات، کێ تیکەیەك نانم دەداتێ، کێ بە هانامەوە دێو لەم برسێتییە ڕزگارم دەکات؟ کێ لەم چۆڵو بیابانەدا دەنگم دەبیستێو بە فریام دەکەوێت؟!

پیـاوە باشـەکە زۆر بەزەیی بـە حاڵیدا هاتەوە، هـەر بۆیە لە ئەسـپەکەی دابەزیو خـواردنو ئـاوی بۆ برد، لەو بیابانە چۆڵو بێرووندەدا کـە جگە لە خودا دەنگی بە هیچ کەس نەدەگەیشت، هەموو داواکارییەکانی بۆ جێبەجێکرد، پاش ئەوەی نانو ئاوی خواردو زۆر سوپاسی ئەم پیاوە باشەی کرد، لە هەمان کاتدا داوای لێکرد لە دوای خۆیەوە سواری بکاتو لەو بیابانە چۆڵە ڕزگاری بکات، تا دەگاتە شوێنێك ئاوەدانی لێبێت!

پیاوە باشـەکە پێی گوت: نا لە دوای خۆمەوە سـوارت ناکەم، بەڵکو تۆ بە تەنها سەرکەوەو من بە پێ دەڕۆم، هەر چەندە سەرەتا پێداگری کرد، بەڵام سەرەنجام ڕازیبوو، پێکەوە ڕۆیشتن، خاوەن ئەسـپ پیادەو لێقەوماویش بە سـواری، تا ئەو کاتەی زۆریان نەمابوو بگەنە ئاوەدانی، وتـی: تۆ پێویسـت بە حەوانەوەیەو ماندوویـت، نۆرەی منە بە پێ بڕۆم، لەم قسـانەدا بوو، جڵەوی ئەسـپەکەی توند کردو غاریداو خاوەن ئەسـپو فریاد ڕەسەکەی بیابانی جێهێشت! لە خاوەن ئەسپ دوورکەوتەوە، خاوەن ئەسپ سەرەتا سەری سوڕما! ئەوە چی ڕوودەدات؟! پاشان بیـری کـردەوەو زانی ئەو کابرایەی لە کەنـاری مەرگ بوو، دزەو ئەوە پـلان بووە بۆئەوەی ئەسپەکەی لێ بدزێت! خاوەن ئەسپ بانگی کرد: تکایە بووەستە تەنها یەك قسەت پێ دەڵێم، پاشان بڕۆ! سوودی نەبوو، بۆ جاری دووەم بانگی کردەوە: ڕەحمەتی خودات لێبێت، بەڵێن بێت ئەسـپەکەم ناوێتەوەو بۆ تۆ بێت، تەنها ڕابووەسـتەو گوێبگرە با یەك قسەت پێ بڵێم! دزەکە کاتێك گوێی لەم قسەیە بوو لە دوورەوە وەستاو وتی: فەرموو چیت دەوێت بیڵێ: گوێم لێتە!

دەزانـن ئەم پیاوە چی پێگوت؟ ڕەنگە هەموومان وا خەیاڵ بکەینو بڵێین، پێی وتووە ئەمە وەڵامدانەوەو پاداشـتی چاکەکەم بوو؟ یاخود ڕەنگە وا هەسـت بکەین ویستوویەتی بە هەر فێڵێك بێت بە دەم قسـەکردنەوە لێی نزیك بێتەوەو ئەسـپەکەی لێ بسەنێتەوە! نا خۆشەویستان ئەم پیاوە باشە بە کابرای دزو بێ وەفای گوت: **سوێندت دەدەم بە خودا، ئەم کارەت لای خەڵکی باس مەکە، نەبادا بە بڵاوبوونەوەی ئەم دەنگوباسە خەڵکی چاکەو پیاوەتیان لەلا ناشیرین ببێتو یارمەتی لێقەوماوان نەدەن!!**

داواکاری ئەم پیاوە لێبوردەو بەخشـندەیە لەو کەسـەی پەلاماری ئەسـپەکەی داوەو فڕاندوویەتی، لەو کەسـەی لە لێواری مەرگ ڕزگاری کردووەو لە بیابانی چۆڵو بێرووندا

بــە هانایەوە چووە، ئەوەیە کە داوای لێــدەکات هەواڵەکە لای خەڵکی باس نەکات، نەبادا خەڵکی لە پیاوەتیو چاکەکردن دوور بکەونەوەو پەشیمان ببنەوە!

ڕەنگە ئەم هەڵوێستەت بە لاوە سەیر بێت، بەڵام ئەم کەسە چاکەی نەکردووە بۆئەوەی مرۆڤ پاداشــتی بداتەوە، ئەو تەنها لەبەرخاتری خودایــەك چاکەکارە کە هیچ چاکەیەکی لێ ون نابێت، بۆیە هیچ کات لە چاکەکردن پەشیمان نییە، هەربۆیە داوا لە دزەکە دەکاتو دەڵێــت: ئامان زمانت بگــرەو ئەم ڕووداوە بۆ کەس نەگێڕیتــەوە، نەبادا بیرۆکەی خراپو ڕەشبینانە لە نێو خەڵکیدا بڵاوببێتەوەو بترسن لە یارمەتیدانو هاریکاریکردنی لێقەوماوان!

سەرنج بدە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ، خەڵکی بە پێچەوانەی ئەم پیاوە باشەوەن، زۆر کەم لە دەمی خەڵکی چاکەو پیاوەتیو هەڵوێســتی مەردانە دەبیســتین، هەر کەس بدوێنی گلەیی لە دەوروبەرو دۆســتەکانی دەکات، نموونەگەلێك دەبیســتین کە جگــە لە بڵاوکردنەوەی ڕەشــبینیو نائومێــدی ســوودێکی تری نییە! ئێســتا دەپرســین ئایا دەکرێــت لەمەودوا چاکەکارانو گەشبینان بکەینە سەرمەشقی خۆمانو چاویان لێ بکەین؟

دەگونجێت ئێمەش لەمەودوا تەنها بیرۆکە چاکەکانو گەشــبینەکان بڵاوبکەینەوە، لە بەرامبەردا هەوڵبدەین بیرۆکە خراپو کردارە ناشیرینەکان بشارینەوەو باسیان نەکەین؟

چ زیانێکــی هەیە ئەگەر بە شــێوەیەکی پۆزەتیــف بیربکەینەوەو هانــی نەوەکانمان بدەین بۆ ســەرکەوتنو هەڵوێســتی مەردانــەو چاکەو پیاوەتی کردن؟ بۆچی هەمیشــە ڕەشــبینانە بۆ دنیاو دەوروبەرەکەمان دەڕوانینو هەموو پەنجەرەی هیواو ئاواتو گەشبینییەکان لەسەر خۆمان دادەخەین؟!

کەواتــە خوێنــەری ئازیز، با پێکــەوە بەڵێن بدەیــن، لەمەودوا تەنها هیــواو ئاواتو گەشــبینی بڵاوبکەینەوە، با بەردەوام هەواڵی خۆش بە خەڵکی ڕابگەیەنین، هەر چەندە دووچــاری ناخۆشــیو نارەحەتیش هاتبین، بزانە کە بەرەکــەتو ڕەحمەتی خودا یەکجار زۆرەو خەزێنەو گەنجینەکانی بێ سنوورە.. با هەموو شتێکی جوانو چاك گەورە بکەینو بڵاوی بکەینەوە، هەموو شــتە ناشیرینو خراپەکانیش بچووك بکەینەوەو بیانشارینەوەو هیــچ کات نەیان درکێنین! بزانە ئەمە کارێکی پێویســتو گرنگە لەم زەمانەی زۆرێك لە خەڵکی سکاڵای بێزاریو نائومێدی بووەتە ویردی سەرزاریان.

وەکو ڕووناکی خۆر بە، بە تیشــکی ڕووناكو زێڕینی هەورە ڕەشــەکان دادەپۆشێت، بەهەرەو بەخششەکانی خودا بۆ خەڵکی باس بکە، ئازارەکانی ژیانیان لەسەر سووك بکە بە ئاڕاستەکردنیان بۆ ڕووناکیو بیرکردنەوەی لەبارو پۆزەتیف، چاکەکانیان بۆ دەربخەو خراپەکانیان بشارەوە.

# قەناعەت گەنجینەیەکی لە بن نەهاتوو!



دەگێڕنەوە کە پاشایەك لە پاشاکان سەرۆکایەتی شارێکی گەورەی دەکرد...

ئەم پادشـــایە کەسێکی زۆر بەخشندەبوو، بە نەرمو نیانیو دادپەروەری مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی شـــارەکەی دەکردو خەڵکی شـــار زۆریان خۆشدەویست... ســـەرەڕای هەموو ئەو کارە جوانانەی هێشتا لە خۆی ڕازی نەبوو...

بەیانییەك پادشا بە دەنگێکی زۆر خۆشو ناسكو خەم ڕەوێن وەخەبەرهات!

دەنگەکە پادشـــای زۆر سەرســـام کرد، بۆیە زۆر بە خێرایی بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت کە ئەو دەنگەی لێوە دەهات، ڕووانی بۆ ســـەرچاوەی دەنگەکە، بینی ئەو خزمەتگوزارەیە کە لە باخچەکەیدا کاردەکات، لە ڕووخســـاریدا جگە لە بەختەوەریو ئاسوودەیی شتێکی دیکەی لێ بەدی نەدەکرا!

پادشـــا بانگـــی کـــردو پرســـیاری لێکرد: چـــۆن ئەوەنـــدە بەختەوەریت لـــە کاتێکدا تۆ

خزمەتگوزارێکی لە نێو باخچەکەی ئێمەداو داهاتێکی کەمت هەیە؟ بەڵام وادەردەکەویت کە خاوەنی هەر شتێکی کە خۆت دەتەوێتو یەکجار دڵخۆش دیاری!

خزمەتگوزارەکەش بەوپەڕی ئارامییەوە وەڵامی دایەوەو وتی: لەبەرئەوەی لای پادشا کار دەکەمو داهاتەکەشم بەشی پێداویستی ژیانم دەکاتو لە هەمان کاتدا شوێنی حەوانەوەم هەیە کە خانەوادەکەم بە ئاسوودەیی لە نێویدا ژیان دەگوزەرێنن! خێزانەکەشم زۆر ئاسوودەو بەختەوەرەو ڕازییە بەو ژیانەی کە هەمانە، ئەمەش منی زیاتر دڵخۆشو ئاسوودە کردووە!

ئیدی شتێکی دیکە بە لای منەوە گرنگ نییە، چونکە لەسەر خوانەکەمان نانێك هەیە پێکەوە لەگەڵ خانەوادەکەم بیخۆین، بە برسێتی شەوگار بەسەر نابەین.

پادشا بە قەناعەتو بەختەوەریو ئاسوودەیی ئەم خزمەتگوزارە کە گەیشتۆتە چڵەپۆپە، زۆر سەرسام بوو!

پاشان جەنابی پادشا گەڕایەوە نێو کۆشكو بانگهێشتی وەزیرە تایبەتەکەی خۆی کردو تەواوی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە.

وەزیر لە کاتێکدا کە زۆر بە پەرۆشەوە گوێی بۆ قسەکانی جەنابی پادشا گرتبوو، بە بیستنی ئەو چیرۆکە ئەویش وەکو پادشا گەلەك سەرسام بوو.

بەڵام لە هەمان کاتدا پێشنیاری کرد کە کارێك ئەنجام بدەن.

پادشا وتی: چۆن کارێك؟

وەزیر وتی: بیرۆکەی ٩٩!

پادشا بەو پێشنیارە زۆر سەرسام بوو، بۆیە پرسی ئەوە مانای چییە؟

ئەویش وتی: ٩٩ سکەی زێڕ دەخەینە کیسەیەکەوەو لە شەودا بێئەوەی کەس هەستمان پێ بکات لەبەردەرگای ماڵی ئەو کرێکارە دایدەنێین، پاشان چاودێری دەرەنجامەکەی دەکەین؟

پادشا پێشنیارەکەی وەزیری لا پەسەند بوو، لەبەرئەوە بڕیاریدا ئەو تاقیکردنەوەیە ئەنجام بدات، چاوەڕێی کرد تا شەو داهات، پاشان کیسە زێڕەکەی لە بەردەم ماڵی کرێکارە هەژارەکە داناو لە دوورەوە چاودێرییان دەکرد تا بزانن چی ڕوودەدات!

دوای ماوەیەك کرێکارە هەژارەکە بۆ داخستنی دەرگای ماڵەکەیان هاتە دەرەوە، بینی

کیسەیەك لە بەردەرگا کەوتووە، کاتێك کیسەکەی کردەوەو بینی ئەو هەموو زێڕەی تێدایە لە خۆشـیدا خەریکبوو باڵی دەگرت، بانگی هاوســەرو منداڵەکانی کردو پێی ڕاگەیاندن کە کیسەیەك زێڕی لە بەردەم دەرگا دۆزیوەتەوە!

ئەم هەواڵە هەمووانی یەکجار دڵخۆش کرد، دەرگاکەی داخستو چوونە ژوورەوە، شەوگار درەنگــی کرد، دنیا بەرەو خامۆشــی دەڕۆیشــتو ئەندامانی خێزانەکەی نووســتن، پادشــاو وەزیریش کە لە کلاووڕۆژنەی ماڵەکەیانەوە چاودێری دەکردن، بینی وا کرێکارەکە دەستی بە ژماردنی زێڕی نێو کیسەکە کردو کاتێك زانی سکەکانی نێو کیسەکە ٩٩ دانەیە، لەبەرخۆیەوە وتــی: گومانــی تێدا نییە ئەم ســکانە ١٠٠ دانە بــوون، دیارە دانەیەکیــان کەوتووە، بۆ ئەم مەبەســتە هاتە دەرەوەو دەســتی کردە گەڕان بە دوای ئەو تاکە زێڕەدا تا ژمارەی زێڕەکانی نێو کیسەکە ببێتە ١٠٠ دانەی تەواو!

زۆر گەڕا بە تەواوی ماندووبوو، بەڵام بێ ئاکام بوو، پاشــان بە خۆی گوت: کێشــە نییە لــە مەودوا زیاتر کار دەکەم تا بتوانم ســکەیەکی زێڕ بکــڕمو ژمارەی زێڕەکانم بگەنە ١٠٠ سکەی تەواو!

شەوگار بە تەواوی درەنگ بوو، بەو حاڵەوە گەڕایەوە ژوورەوەو نووست، بەڵام بۆ بەیانی زۆر درەنگ وەخەبەر هات، کە زانی کات درەنگەو لە کارەکەی دواکەوتووە، زۆر قسەی ناخۆشی بە هاوســەرەکەی گوت، ئەو هاوســەرەی کە لەوەو پێش زۆر بەســۆزو بەزەییو میهرەبانیو نەرمونیانییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، پاشان هاواری کرد بەسەر منداڵەکانیداو دەیگوت: بۆچی زوو بە خەبەرتان نەهێناوم، ئەو منداڵانەی کە تا دوێنێ گۆنای یەك بە یەکیانی ماچ دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریاندا، پاشان جێی دەهێشتنو دەڕۆیشتە سەرکارەکەی!

کرێکارەکە ســەرەڕای هەموو ئەو گۆڕانکارییە خێرایانە ماڵی جێهێشتو بەرەو کارەکەی ملــی ڕێگەی گرت، بەڵام زۆر ماندووبوو، چونکە شــەو جگــە لە ماندووبوونی بۆ گەڕان بە دوای ســکە زێڕەکەدا، وەکو پێویست نەخەوتبوو، هەروەها هەموو ئەو ڕەفتارانەی کردبووی بەرامبەر بە هاوسەرەکەیو منداڵەکانی تەواو بێتاقەتو بێزاری کردبوو!

کاتێك گەیشــتە ســەر کارەکەی، هەستیکرد کە ناتوانێت وەکو ڕۆژانی ڕابردوو کار بکات، هەروەها ئەو گۆرانییە خۆشانەی کە ڕۆژانی پێشوو دەوروبەری سەرسام دەکرد، ئەمڕۆ نەك

نەمابــوو، بەڵکو خەمو پەژارەو بێتاقەتیو شــەکەتی جێگەی گرتبووەوە، لەگەڵ ئەوەشــدا بە نیازبوو لە ڕۆژانی پێشــوو زیاتر کار بکات، تا داهاتی زیاتر دەســتبخات بۆ کڕینی ســکە زێڕەکە!

پادشا کە بە درێژایی ئەو شەوە ئاگاداری تەواوی سیناریۆکە بوو، زۆر سەرسام بوو!

لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییە خێرایانە پادشا هێشتا وا گومانی برد کە ئەو کرێکارە دەتوانێت بەختەوەرییەکەی جارانی بە دەست بهێنێتەوە، ئەگەر ببێتە خاوەنی ئەو پارچە زێڕەو سکەکانی بگەنە «١٠٠» سکە!

ئــەو کات بە دڵنیاییــەوە ئەم کرێکارە دەتوانێت هەرچی خانەوادەکەی حەزی لێ بکاتو پێیان خۆشبێت بۆیان دەستەبەر بکات، بەڵام بە داخەوە ئەوە ڕووی نەدا!

وەزیر زۆر بە باشی گوێی بۆ قسەکانی جەنابی پادشا گرتبوو، پاشان پێی گوت: جەنابی پادشا ئەم کرێکارە ئەو بارودۆخە پڕ ئارامیو هێمنییەی کە تێیدا بوو، هۆکارەکەی ئەوەبوو کــە قەناعەتیان بەو داهاتە کەمە هەبوو کە خاوەنــی بوون، ئەوان بەختیار بوون، چونکە شــتێك نەبوو لە ژیاندا ســەرقاڵیان بکات، ئەوان بەرهەمی ئــەو قەناعەتەیان دەخوارد کە هەیــان بــوو، بەڵام ئەمڕۆ کە لە ناکاو بە بێ ماندووبوون بۆتە خاوەنی «٩٩» ســکەی زێڕ، هەر بۆیە قەناعەتیان پێی نییەو داوای زیاتر دەکەن!

ئایا دەزانیت کاتێك مرۆڤ لە ناکاو سەروەتێکی زۆری دەستدەکەوێت بەبێ ماندووبوون، قەناعەتــی پــێ ناکاتو بەردەوام بە دوای زیاتردا دەگەڕێت، تەنانەت ئەگەر بەشــی هەموو پێداویستیەکانیشی بکات؟!

پادشــا قەناعەتــی بە وتەی وەزیرە ژیــرو لێهاتووەکەی کردو بڕیاریــدا لەمڕۆ بەدواوە کە قەدرو ڕێزی هەموو ئەو شــتانە بگرێت کە خاوەنییەتی، تەنانەت شــتە بچووکەکانیش، سوپاسی خوداش بکات لەسەر هەموو ئەو بەهرانەی کە پێی بەخشیوە، زۆر ڕاستە کە وتراوە قەناعەت ئەو گەنجینەیەیە کە هەرگیز لە بن نایەت!

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت هۆکاری بەختەوەری مرۆڤ قەناعەتە، نەك سەروەتو سامان!

# پێڕست